# دیموکراسی

# و

# توخمە پێکهێنەرەکانی

**کۆمەڵێک نووسەر**

وەرگێرانی

**مستەفا مەعروفی**



هەولێر - ٢٠١١

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● **دێمۆکراسی و توخمە پێکهێنەرەکانی**

● **نووسینی:** کۆمەڵێك نووسەر

● **وەرگێڕانی:** مستەفا مەعروفی

● **نەخشەسازی ناوەوە:** ڕێدار جەعفەر

● **بەرگ:** هۆگر سەدیق

● **ژمارەی سپاردن:** (٤٦٣) لە ساڵی ٢٠١١

● **نرخ:** (٢٠٠٠) دینار

● **چاپی یەکەم:** ٢٠١١

● **تیراژ:** ٥٠٠ دانە

● **چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات** (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٥٧١)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com



# ناوەڕۆك

## سەرەتا

هەوڵدان بۆ گەیشتن بە سیستەمێکی سیاسیی باش‌و دادپەروەرانە لە کۆنەوە مێشکی مرۆڤەکانی بە خۆیەوە خەریك کردوە. یۆنانییە کۆنەکان یەکەم کەس بوون هۆیەکانی پێویستیی گەیشتن بە سیستەمێکی ئەوتۆیان سەلماند. پرسیارێك کە بۆ وان جێی باس بوو ئەوە بوو کە کام سیستەمی سیاسی‌و کام شێوە حکوومەت باشترین‌و گونجاوترینە؟ ئەم پرسیارە بە رواڵەت سادەیە، بە درێژایی مێژوو بۆتە سەرەکی‌ترین پرسیاری هەموو فەلسەفەکان.

ئایا دەتوانین بڵێین ئەمڕۆ، واتە لەسەرەتای سەدەی بیست‌ویەکەمی زایینیدا هەوڵ‌و تێکۆشانی بێ‌وچانی مرۆڤ بە مەبەستی دۆزینەوەی وەڵامێکی شیاو بەم پرسیارە، سەرکەوتنی بەدواوە بووە؟ بۆ کردنەوەی زیاتری باسەکە دەبێ بڵێین لە هەر جێیەك مرۆڤەکان دەسەڵات بەسەر بەشێکی دیکە لە مرۆڤەکان دا دەکەن ـ واتە بەکردەوە لە هەموو سیستەمە سیاسییەکاندا ـ پرسیاری لەسەر هەقبوونی ئەم سیستەمە دەبێتە پرسیاری سەرکی. بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین دیموکراسی یان بەو جۆرەی لە فارسیدا پێی دەڵێن" خەڵك سالاری" تەنیا سیستەمی سیاسی لە جیهان دایە کە وەڵامێکی شیاو دەداتەوە بە پرسیاری هەقانییەتی دەسەڵات. هەر بۆیە هەرچەند ئەو شێوە حکوومەتە لە چەند وڵاتێکی جیهاندا جێگیرو چەسپاوە، بەڵام وەك نموونەیەکی باش بووە بۆ ڕێ‌وشوێنی بەڕێوەبردنی وڵات، بە شێوەیەکی خێرا جێگەی خۆی لە بیروڕای گشتیی جیهاندا کردۆتەوە.کەم نین ئەو وڵاتانەی ئەمڕۆ سەرەڕای ئەو هەمووە کەندو کۆسپەی لە بوارەکانی سیاسی، ئابووری‌و کۆمەڵایەتی لەسەر ڕێگەیانە بۆ گەیشتن بە دیموکراسی خەبات دەکەن. لە لایەکی دیکە هیچ سیستەمێکی سیاسی تەنانەت ڕەشترین حکوومەتە دیکتاتۆرو سەرەڕۆکان نایینی خۆیان بە سیستەمێکی نا دیموکرات بزانن. داخوا ئەمە بۆخۆی نیشانەی لەسەر هەق بوونی دیموکراسی نیە؟

دیاره ئەمە بەو مانایە نیە کە دیموکراسی بێ کەموکووڕییە . ئاشکرایە، تا ئەمڕۆ تەنانەت سیستەمە سیاسییە دیموکراتەکانیش نەیان توانیوە وەڵامێکی تەواو بە هەموو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان بدەنەوە بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە دادپەروەریی کۆمەڵایەتییەوە هەیە. بەڵام دەبێ لە نێوان سیستەمێکی ئایدیالیو ئارمانیو باشترین سیستەمی سیاسیی مەوجوددا جیاوازی دابنرێ، واتە لە نێوان ئەو شتەدا کە دەبێ هەبێو ئەو شتەی کە بەڕاستی بە باشترین شێوە هەیە. جگە لە گیروگرفتی پێوەندیدار بە دابەشکردنی نێعمەتەکان، ئەگەری وەرگرتنی کەڵکی خراپ لە دەسەڵات لە هەموو سیستەمە سیاسییەکاندا، دیموکراسییشی لەگەڵ بێ، هەیە. بەڵام دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ دیموکراسی تەنیا سیستەمێکە لە ڕێگەی دانانی ڕێوشوێنی دیاریکراو لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا ، بە مەبەستی پێشگیری لەو جۆرە کەڵکی خراپ وەرگرتنانە جیددیترین هەنگاوی بۆ ئەم ئەگەرانە هەڵ گرتوە. ئەم ڕێوشوێنانە کامانەن؟

دەسەڵات بەپێی سروشتی خۆی بەدەوام حەزی لە زیاد کردنو کۆکردنەوەیە. کەوابوو سروشتو ئامانجی هەر دەوڵەتێك لە خۆیدا، پەرەپێدان بە پانتای دەسەڵاتی خۆی لە نێوەوەو دەرەوەی سنوورەکانیدایە. ڕاست لەبەر ئەم هۆیە دەسەڵات دەبێ هەمیشە لە ژێر کۆنترۆڵو چاوەدێری دابێو سنووری بۆ دابنرێ. سنووری هەموو دەوڵەتو حکوومەت ئەو جێگەیەیە کە لەگەڵ شەئنو حورمەتی مرۆڤ تێك هەڵ دەنگوێ. چار نیە ئەم شتە پێوەندییەکی پڕ لە کێشە لە نێوان مافی مرۆڤەکانو شێوەی ڕێکخستنی دەوڵەت دا پێك دێنێ. کەوابوو هەڵە نیە ئەگەر بڵێین سەرەکیترین کێشەی سیستەمێکی سیاسیی دیموکرات ، ڕێکوپێك کردنی پێوەندیی پڕ لە کێشەی نێوان ئازادیی مرۆڤ لەگەڵ کۆمەڵو دەوڵەت دایە لە ڕووی ئەقڵەوە. ئەو ڕێوشوێنانەی دیموکراسی بۆ ئەم مەبەستە دیانگرێتە بەر، جۆراوجۆرنو وەك توخمو تایبەتمەندییە پێکهێنەرەکانی سەیریان دەکرێ. گرینگترین تایبەتمەندییەکانی دیموکراسی دەتوانین لە پرەنسیپەکانی خوارەوە دا کورت بکەینەوە:

ـ وەبەرچاو گرتنی شەئنی مرۆڤ و مافی مرۆڤ، وەکوو بایەخێکی بنەڕەتی،

ـ قبووڵ کردنی فرەچەشنی یان پلۆرالیزمو شەفافیەت لە پێوەندییەکانی دەسەڵات دا،

ـ دەسەڵاتی خەڵك لە ڕێگەی بەشداریی سیاسیی وان لە کاروبارەکانو هەڵبژاردنداو مەشروعییەت دان بە دەسەڵات،



ـ نیهادەکانی دەوڵەت لە وەڵامدانەوە بە خەڵك دا بەرعۆدە بن،

ـ ئازادیی حیزبو ڕێکخراوو ئەنجومەنەکان وەکوو لۆسە(اهرم)ی سەپاندنی ئیرادەی سیاسیی خەڵكو ئیمکانی ئاڵتەرناتیڤ یان بەدیل بۆ حکوومەت،

ـ ئازادیی بیروباوەڕ، دەربڕینو قەڵەم وەکوو نوێنگەی ژیانی دیموکراتیکی کۆمەڵ،

ـ دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی دەوڵەت وەکوو لۆسەیەك بۆ دەستەبەری ئازادیو کۆنترۆلی دەسەڵات،

ـ حکوومەتی قانوون، واتە بەرابەریی هەموو کەس لەبەرامبەر قانوون داو وەبەرچاو گرتنی قانوون لەلایەن هەموو کەسەوە چ نیهادی حکوومەتی بێ،چ هاووڵات،

ـ شەفافیەت لە مەیدانی سیاسەتی دەرەوەدا بۆ داڕشتنی پێوەندییەکی عەقلانی لەگەڵ دەوڵەتانی جیهان لە ئاستی نێونەتەوەییدا،

ـ پێویستیی بوونی فەرهەنگێکی دێموکراتیك.

دەکرێ بڵێین ئەم پرەنسیپانە وەکوو خشتێك وان کە بینای دیموکراسیان پێ دادەڕێژرێ. لەم وتارە دا لە نزیکەوە ئەم پرەنسیپانە هەڵ دەسەنگێنین.

## شەئنی مرۆڤ

"شەئنی مرۆڤ" بنەڕەتی ترین بایەخی سیستەمێکی دیموکراتیکە. دیموکراسی لە دیاریکردنی سیستەمی بایەخەکانی خۆیدا، پشتی بە پێناسەیەکی تایبەت لە بارەی مرۆڤدا ئەستووره. بە پێی ئەم پێناسەیە، مرۆڤ دەبووا ئازاد بێ، بە واتایەکی دیکە بتوانێ بە بڕیاری سەربەخۆ خزمەت بە گەشەکردنو هەڵدانی کەسایەتیی خۆی بکا. بەپێی ئەم پێناسەیەی مرۆڤ، هەر کەس خاوەنی شەئنی مرۆڤایەتییە. ئێستا با بزانین واتای ئەم شەئنە مرۆڤایەتییە چیە؟

ئەوەی مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ و لە ئاژەڵانی جیا دەکاتەوە، بێگومان هێزی بیرکردنەوەو عەقڵیەتی، بە تایبەتی تێگەیشتنی وی لە بارەی ئینسانییەتی خۆی دایە. لە حاڵێکدا ئاژەڵ بە سروشتەوە بەستراوەتەوەو بە شێوەی غەریزی دەجووڵێتەوە. مرۆڤ بە هۆی بیرکردنەوەی خۆی

دەتوانێ خۆی لە سرووشت دابڕێو بەسەری دا زاڵ بێ. لە پانتای بیرو دەروونی مرۆڤ دایە کە کەسایەتییەکەی دەگۆوڕێ و نەك هەر لەگەڵ سروشتو جیهانی مادی، بەڵکوو لەگەڵ بیرو جیهانی مەعنەوییشدا پێوەندی دادەمەزرێنێ. ئەم تایبەتمەندییە، تایبەتمەندییەکە کە تەنیا لە مرۆڤ دا کەسایەتی پێك دێنێو دەبێتە هۆی ئەوەی کردەوەی خۆی بە شێوەیەکی ئامانجدار، بە بەرنامەو داهێنەرانە بەرەو پێشەوە ببا. بە واتایەکی دیکە شەئنی مرۆڤ یانی توانای رووحیی ئەو بۆ تێگەیشتن لە خۆیو شان وەئەستۆگرتنی بەرپرسایەتی لە دیاریکردنی ڕێگەی ژیانی خۆی دا.

کەوابوو ئەگەر قەرار وایە مرۆڤ وەك مرۆڤ بژی، نابێ حورمەتو شەئنی وی پێشێل بکرێو لە دەستدرێژیکرانە سەر بە دوور بێ. ئەوە بە مانایەیە خاوەن دەسەڵاتەکان ڕێگەیان پێ نەدرابووایە بۆ گەیشتن بە مەبەستە سیاسی، ئابووری، یان ئایدیۆلۆجییەکانیان وەکوو ئامراز کەڵك لە مرۆڤ وەربگرن. ئیمانوئێل کانت فەیلەسووفی قۆناغی رۆشنگەری لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە هەر زاتێکی ئاقڵ، تەنیا شتێکە کە وەك "غایەتی فی نەفس" بوونی هەیە، نەك وەکوو ئامرازێك ئەم یان ئەو ئیرادەیە بتوانێ بەشێوەیەکی تەکڕەوانە بیخاتە خزمەت خۆیەوە. کەوابوو مرۆڤ لە هەموو هەڵسوکەتەکانی دا، چ پێوەندیی بەوییەوە هەبێو چ نەبێ، بەردەوام لە یەك چرکەش دا دەبێ لە پلەی"غایەت" دا سەیری بکرێ. هەر بۆیە لە روانگەی کانتەوە هەموو شتومەکەکان نرخیان هەیە، ئەوە تەنیا مرۆڤە خاوەنی شەئنو حورمەتە.

ڕێز گرتن لە شەئنی مرۆڤ، لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا راست بە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ لە مافێکی ئازادیی تاکەکەسیی ئەوتۆ بەهرەمەند بێ، کە ئەو توانایەی پێ ببەخشێ لە هەلومەرجی تایبەتیو بوونی ئیمکانی جۆراوجۆردا بڕیارێکی ئازادو سەربەخۆیانە بۆ رەفتارو هەڵسوکەوتی خۆی بدا. چونکە مرۆڤ تەنیا ئەو کاتە لە رووی بەرپرسایەتییەوە هەڵسوکەوت دەکا کە بەپێی ئیرادەی ئازادی خۆی بجوولێتەوە.

لەم پێوەندییە دا ئازادی شتێکی ئینتیزاعی نیە. بەڵکوو راست بە مانای ئازادی لە دیاریکردنی شێوەی ژیان دا، ئازادیی ئایینو جیهانبینیو کاروباری ویژدانی، ئازادیی هەڵبژاردنی کارو هەڵسوکەوتی ئازادانە لە بارەی خاوەندارەتیی تایبەتیو کاروباری لەم چەشنەیە. جگە لەوە، ئازادی لێرەدا بە مانای پێشێل نەکرانی چوارچێوەی تایبەتیو ئەمنییەت لە بەرامبەر کردەوەی



سەرەڕۆیانەی نیهادە دەوڵەتییەکانیش دایە. تەنیا ئەو دەوڵەتو حکوومەتەی بەسەرنجدان بە شەئنی مرۆڤ باوەڕی بەم جۆرە ئازادیانە هەیە، مافی ئازادیی مرۆڤەکانیش وەبەر چاو دەگرێ.

ویستی ئازادیی تاکە کەسی و مافی گەشەکردنی کەسایەتیی مرۆڤ و بەرابەریی هەموو مرۆڤەکان لە بەرامبەر قانووندا لەم جۆرە پێناسەیەی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین نابێ ئازادییە تاکە کەسییەکان ببنە قانوونێکی موتڵەق. هەموو ئازادییەکان رادەو سنووریان هەیە. سنووری ئازادی تا ئەو جێگەیەیە کە ئازادیی خەڵکی دیکە پێشێل دەکا. هەر بەم هۆیەشە بەرەسمی ناسینی شەئنی مرۆڤ هاوکات بە مانای ئەرکی وەبەرچاو گرتنی شەئنو ئازادیی مرۆڤەکانی دیکەشە. کەوابوو ئازادیی بەرابەر بۆ هەموو هاووڵاتانی کۆمەڵگەیەك لە ویستەحاشاهەڵنەگرەکانی دیموکراسییەو سیستەمێکی دیموکراتیك بەم پێوانەیە هەڵ دەسەنگێندرێ کە تا چ رادەیەك توانیویەتی ئازادییە تاکەکەسییەکان بۆ هەمووان وەبەرچاو بگرێو ئیمکانیان بۆ پێك بێنێ.

بەسەرنجدان بە پێناسەیەکی ئەوتۆ لەبارەی مرۆڤ دایە کە دەتوانی لە زاتو جەوهەری دێموکراسی بگەی. بە گوێرەی ئەمە بە سیستەمێك دەگوترێ دیموکراتیك کە بەفەرمی ناسینی شەئنی مرۆڤ وەکوو بنەرەتیترین بایەخ، وەدوای ئەم مەبەستە دەکەوێ کە بۆ هەموو هاووڵاتانی خۆی، بە شێوەیەکی یەکسان، ئازادیو گەشەکردنی کەسایەتی بۆ وەدەستهێنانی ژیانێکی بەرپرسانە دابین بکاو زەمینەی کۆمەڵایەتیی پێویستی بۆ پێك بێنێ. کەوابوو دێموکراسی کۆمەڵێك راسپاردەی رواڵەتی نیە، بەڵکوو نێوەرۆکی خۆی لەم ڕێگەیەوە دیاری دەکا کە لە هەلومەرجی مێژووییو کۆمەڵایەتیی جۆراوجۆر دا بەرزترین پلەی ئازادی، بەرپرسایەتیی شەخسیو دادپەروەریی کۆمەڵایەتی وەدی بێنێ.

ئەزموونە مێژووییەکان نیشانیان داوە موتڵەق کردنی هێندێك لە پرەنسیپەکانی دێموکراسی وەکوو" حکوومەتی زۆرایەتی" دەتوانێ ئامانجی دێموکراسی بخاتە مەترسییەوە. چونکە زۆربەش هەڵەی لێ روو دەدا. هەربۆیە پێویستە شەئنی مرۆڤ وەکوو بنەڕەتی ترین بایەخی دێموکراسی تەنانەت لە لایەن گەورەترین حکوومەتە زۆرایەتییەکانیشەوە وەبەرچاو بگیرێ.

## فرەچەشنی یان پلۆرالیزم

گوتمان دێموکراسی ئازادیی فەردیی قبووڵە. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین لە سیستەمێکی دیموکراتیك دا ئەکتەرە واقعییەکان ئیدی نەك یەك یەکی هاووڵاتان بەڵکوو بەشی زۆری گرووپە کۆمەڵایەتییەکانن، کە لە ریزی ئەنجومەن، رێکخراوو حیزبەکان دا بە رێکخستنی تاکەکان لە (ریزی) خۆیان دا، وەدوای ئامانجو مەبەستە کۆمەڵایەتییە دیاریکراوەکانی خۆیان دەکەون. کەوابوو دەکرێ ئەم جۆرە گرووپە کۆمەڵایەتیانە وەك ئامرازێك سەیر بکرێن کە یارمەتی بە یەك یەکی تاکەکان دەدەن تاکوو لەرێگەی هاوپێوەندیی بە کۆمەڵ بەسەر توانا فەردییەکانی خۆیان لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا زاڵ بنو وەدوای ئامانجە تایبەتییە هاوبەشەکانیان بکەون. جۆراوجۆریی رێکخراوە سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەرهەنگییەکانو هەروەها کۆروکۆمەڵە جۆراوجۆرە ئایینییەکان لە کۆمەڵگە دیموکراتیکەکاندا، نوێنگەی ئامانجو بیروباوەڕە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ لەم کۆمەڵگەیانە دایە.

کەوابوو بەپێچەوانەی کۆمەڵگەیەکی پاوانخوازو یەکدەستو دژی ئازادی، ئەو کۆمەڵگەیەی ئازادیی قبووڵە بەناچار کۆمەڵگەیەکی فرەچەشنی یان پلۆرالیستە. فرەچەشنی تەنیا لایەنی کۆمەڵایەتیو ئابووری ناگرێتەوە، بەڵکوو لە کۆمەڵگەیەکی مۆدێرندا بایەخە چاوەروانکراوەکانی مرۆڤیش دەگرێتەوە. جیددی بوونی ئازادیی مرۆڤ لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا بە واتای بێ ئیعتیبار بوونی ئەو جۆرە بڕیارانەن لە سەرەوە را دەدرێنو یان ئە حوکمە سوننەتیانەن کە پێش بە بڕیارە ویژدانییەکانی مرۆڤ دەگرن کە بە پێی بایەخەکانی خۆی دەیان دا. بۆیە ئازادیی فەردی بە شێوەی قانوونی دەرفەتی خۆنواندن بە فرەچەشنیی بیروباوەرکانو بیرو باوەڕە ئایینییەکانو جیهانبینییەکان دەدا. رەنگە ئەم فرەچەشنییە بۆ زۆر کەس شتێکی ناخۆش بێ، چونکە فرەچەشنی جگە لە کێشەیەکی بەردەوام لە نێوان عەلاقەو بیروباوەڕی تاکەکانو گرووپە کۆمەڵایەتییەکان شتێکی دیکە نیە. لە کۆمەڵگەی پلۆرلیستیدا هەر تاك یان گرووپێکی کۆمەڵایەتی لە پێشبڕکێیەکی بەردەوام دان. بەڵام دیموکراسی ناچارە ئەم کێشەو رقەبەرایەتییەی نێوان عەلاقەو وحەزە جۆراوجۆرەکان تەحەممول بکا. چونکە ئەم شتە ئاکامی سروشتیی مافی چارەنووسی مرۆڤ لە سیستەمێك دایە کە ناتوانێ لەگەڵ



پاوانخوازیدا بگونجێ. هەوڵدان بۆ یەکدەست کردنی تاکەکانو بیروباوەڕو حەزو ئارەزووەکانیان مانایەکی جگە لە ئیددیعای بوونی تاقە نوسخەیەکی نەگۆڕ بۆ رێکخستنی کۆمەڵایەتیی مرۆڤەکان، نیە. بەڵام نوسخەیەکی ئەوتۆ قەت نەبووەو قەتیش نابێ. هەرچەشنە هەوڵدانێك بۆ سەپاندنی ئیرادەیەکی دیاریکراو لە ئینکاری فەرچەشنەیی کۆمەڵایەتیدا لە بنەڕەت دا لەگەڵ ئازادیی مرۆڤ لە ناتەبایی دایەو کۆمەڵگەی تووشی بەڵای پاوانخوازی دەکا.

کەوابوو لە کۆمەڵگەیەکی فرەچەشندا هەرچەند کێشەی بەردەوام لە نێوان بیروباوەرە بایەخیە جۆراوجۆرەکانو بۆچوونی سیاسیی جۆراوجۆرو حەزی ئابووریی دژبەیەك لە گۆڕێ دایە، بەڵام سیستەمی دیموکراتیك ئەم مەسەلەیە نەك وەك شەڕ بەڵکوو وەك هێزی گەشەکردن سەیر دەکا کە دەبێتە هۆی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو رێگە نادا بچەقێ. ئەم هێزە کۆمەڵگە بە زیندوویی رادەگرێو کەشوهەوایەکەی بۆ وەرگرتنی رێگەچارەی نوێ دەکاتەوە. تەنیا لە کۆمەڵگەیەکی کراوەو نەرم دایە کە ئازادیی مرۆڤ هاوکات لەگەڵ داهێنانی مەعنەویی کۆمەڵ لە درێژماوەدا دەستەبەر دەبێ. کەوابوو کۆمەڵگەیەك کە بەڵێ بە ئازادی دەڵێ، ناچارە دەبێ مل بۆ فەرچەشنی راکێشێ.

لە سیستەمی دیموکراتیکدا دەوڵەت نەکەوتۆتە سەروەی کۆمەڵ. دەوڵەت خستنە سەرەوەی کۆمەڵ ، بە مانای ئەوەیە ئەو ئەرکە بدەی بە دەوڵەت کە لەسەرەوە را بەشێوەیەکی سەرپەرستیانەو دەسەڵاتخوازانە فەرمانڕەوایی بەسەر کۆمەڵ دا بکا. روونتر بڵێین ، دیاری بکا کام بایەخو بیرو بۆچوون باشن کامە خەراپن. شتێکی ئەوتۆ بەشێوەیەکی قانوونی دەوڵەت دەخاتە لایەنێکەوە. بەڵام لە کۆمەڵگەیەکی فرەچەشندا کە ئەندامەکانی دەتوانن لەرێگەی ئەم کاناڵانەی دیاری کراون لە بەڕێوەبردنی ئیرادەی دەوڵەتدا بەشدار بن، دەوڵەت تەنیا دەتوانێ رۆڵی ئامرازی هاوپێوەندیو وەدیهێنەری ئامانجە هاوبەشەکان بگێڕێ. کەوابوو لەسیستەمێکی دیموکراتیكو فرەچەشندا، ئەوە دەوڵەت نیە ئەرك بۆ خەڵکی دیاری دەکا، بەڵکوو بەپێچەوانەوە ئەوە خەڵکە ئەرك بۆ دەوڵەت دیاری دەکا.

گوتمان لە کۆمەڵگەیەکی فرەچەشندا کێشەیەکی بەردەوام لە نێوان بایەخو بیروباوەڕە جۆراوجۆرەکان، بیروبۆچوونی سیاسیی جۆراوجۆر و حەزی ئابووریی دژبەیەکدا لەگۆڕێدا هەیە.

کەوابوو دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە لە کۆمەڵگەیەکی ئەوتۆدا، ڕێکخستنو دەستەبەری ڕێوشوێن بۆ چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانو چاوەدێری بەسەر ئەم ڕێوشوێنانە دا گرنگییەکی لە ڕادەبەدەری هەیە. ڕقەبەرایەتیی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بۆ دیاریکردنی پێڕەوی داهاتوو، تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ مەترسیی بۆ سەقامگیریی کۆمەڵگە نەبێ‌کە ڕێوشوێنێکی ڕقەبەرایەتیی ئازادو دادپەروەرانەو ئاشتیخوازانە دەستەبەر کرابێ. لێرەدایە کە ڕۆڵی ڕێکخستنو دەستەبەری دەوڵەت گرنگییەکی بنەڕەتیی هەیە، دەوڵەتێك کە لە رووی بۆچوونی بایەخیو ئایدیۆلۆجییەوە بێلایەنە. بۆ سیستەمێکی دیموکراتیك بە تەواوی روونە ئەوە کۆمەڵگە خۆیەتی کە لە ڕێگەی ئامرازی دەوڵەتەوە چاوەدێری بەسەر ڕێوشوێنی یاریی دیموکراتیکدا دەکاو زەمینە بۆ بەڕیوەبردنەکەی دەستەبەر دەکا، ڕقەبەرایەتییەك کە ئامانجەکەی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی بێ و ڕێکوپێکییەك کە دیارە مەبەستەکەی ئازادی بێ نەك ئەوە بۆخۆی لەخۆیدا ئامانج بێ.

## جیایی ئایین لە دەوڵەت

لەسیستەمێکی دیموکراتیکدا کە لەسەر بنەمای فرەچەشنی بێ، دەزگای دەوڵەت وەك پەیکەرێکی گەورە دێتە بەرچاو کە دەبێ کاروباری جۆراوجۆرو جۆراوجۆریی بیروباوەڕو ئایین بگرێتە خۆیو باڵ بەسەر هەموو هاووڵاتان دا بکێشێ. بەڵام شتێکی ئەوتۆ تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ دەستەبەر بێ کە خودی دەوڵەت بێلایەن بێ، واتە مەیلی بەلای هیچ ئایینو ئایدیۆلۆجییەکی تایبەت دا نەبێ. دەوڵەت بە مانا مۆدێڕنەکەی بەشێکی زۆر لە هەقانیەتی خۆی هەر لەم بێلایەنییە ئایینیو ئایدیۆلۆجییەو تەحەمولی جۆراوجۆریی فکرو بیروباوەڕەوە وەردەگرێ. کەوابوو دەوڵەتێك کە ڕێبەرایەتیی کۆمەڵگەی لە ئەستۆیە، کێشە سیاسیو بیروباوەڕییەکان چارەسەر بکا، سنووری ئەرکو دەسەڵاتی هەموو لایەك دیاری بکا، و هەروەها پێوەندییەکانی هاووڵاتانی خۆی دیاری بکا، ئیدی ناتوانێ لایەنێك بگرێ. چونکە ئەگەر وانەبێ، بۆخۆی دەبێتە لایەنێکی کێشەکە. کەوابوو دەتوانین بڵێین جیایی ئایینو ئایدیۆلۆجی لە دەوڵەت، یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی دیموکراسییە مۆدێڕنەکانە.



ئایینو مەزهەبەکان بەپێی سروشتی خۆیان، ئیددیعای هەقیقەتی موتلەقو نەگۆڕو جیهانگیر دەکەن. بەڵام دەوڵەت لە کردەوە سیاسییەکانی خۆیدا بەردەوام لەگەڵ شتە نیسبی، تێپەڕو لە حاڵی جووڵەی ئەم جیهانەدا سەروکاری هەیە. لە کاروباری سیاسیدا هیچ شتێکی تاسەرو نەگۆڕ بوونی نیە. سیاسەت مەیدانی ئاڵوویر، دەمەتەقێ، گونجانو خۆڕێکخستنەو لەم چوارچێوەیەدا ناتوانی تووشی ماهیەتگەرایی بیو بە شتی دوگمەوە بنووسێی. شتێکی ئەوتۆ لەگەڵ ئایین کە کاروباری ئیمانیی موتلەقو نەگۆڕدەگرێتەوە، ناگونجێ. هیگڵ فەیلەسووفی ئەڵمانی لە دیاریکردنی ڕێبازە سەرەکییەکانی فەلسەفەی هەقی خۆی دا دەنووسێ: ئەگەر ئایین بیەوێ لە سیاسەتدا ئیعتیبار بە خۆی بدا، پێکهاتەی دەوڵەت دەرووخێنێ. چونکە لە دەوڵەتدا جیاوازییەکان، پانتاییەکیان بۆ خۆجوێکردنەوە هەیە، بەڵام بەپێچەوانەوە لە ئایینیدا هەموو شتێك بەردەوام بەستراوە بە تەواوەتییەوە. ئێستا ئەگەر ئەم تەواوەتییە بیەوێ باڵ بەسەر هەموو پێوەندییەکانی دەوڵەتدا بکێشێ، دەبێتە هۆی دەمارگرژی، چونکە دەمارگرژی بریتییە لە مەجال نەدان بە جیاوازییە تایبەتییەکانە.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین دەوڵەتێك کە دەبێتە ئامرازێك لە خزمەتی بیروباوەڕە ئایینیو ئایدیۆلۆجییەکان بە ناچار دەست بۆ هێندێك کردەوە دەبا کە ئەگەر لەهەلومەرجێکی دیکەدا بووایە قەت پێویستیی پێیان نەدەبوو. ئەزموونی مێژوویش فێرمان دەکا کە تێکەڵ کردنی ئایینو دەوڵەت، ئازادیی هەردووکیان بەرتەسك دەکاتەوەو زەرەری بۆ هەردوولا هەیە.

جیایی ئایین لە دەوڵەت بە مانای لابردنو لەنێوبردنی ئایین نیە. دەوڵەتی دیموکراتیك نایهەوێ مەعنەویاتو بایەخە ئەخلاقییەکان لە کۆمەڵگەدا بسڕێتەوە. کێشەکە تەنیا لەسەر جیا کردنەوەی نیهادە دەوڵەتییەکان لە کاروباری ویژدانییە. ئەم شتە ئازادیی بیروباوەڕە ئیمانیو قەلبییەکان ناخاتە مەترسییەوە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە دەستەبەریان دەکا.

لەپێناوی سەلماندنی ئەم ئیستیدلالەدا دەبێ بڵێین وەدیهاتنی جیایی ئایین لە دەوڵەت، لە ڕەوتێکی مێژوویی درێژماوەو دژوار دا هاتۆتە دی. سەدان ساڵ درێژەی کێشا تاکوو ئوروپاییەکان ئەم ڕاستییەیان بۆ دەرکەوت سەبرولەسەرخۆیی نواندن لەگەڵ جیابیران بە تەنیا بۆ ئازادیی تەواوی مەزهەبی بەس نیە، و بۆ ئەم مەبەستە دەبێ سیستەمێکی حقووقیی ئەوتۆ پێك

بێ کە لە پێکهاتەکەیدا، ئایینو دەوڵەت بە تەواوی لێك جیا بن. دیارە لە مێژوودا دەوڵەتی وامان پێ شك دێ کە لەبەرامبەر ئایینو مەزهەبی جۆراوجۆردا نەرمیو لەسەرخۆییان نواندوە. بەڵام ئەمڕۆ بەگوێرەی جاڕنامەی مافی مرۆڤ ئیدی ناتوانی ئازادیی تەواوی مەزهەبی تا ئاستی نەرمیو لەسەرخۆیی نواندن بێنییە خوارێ. ئازادیی تەواوی مەزهەبی بە پێی جاڕنامەی مافی مرۆڤ لەهەمان کاتدا بە مانای رەفتاری بەرابەر لەگەڵ ئایینو مەزهەبە جۆراوجۆرەکانیشە. بەڵام نەرمیو لەسەرخۆیی نواندن لەگەڵ کەمایەتییەکی مەزهەبیدا، تەنانەت لە باشترین حاڵەتی خۆیدا، نیشانەی جۆرێك لە نابەرابەریی مەزهەبییە. دەوڵەتێکی ئایینی یان مەزهەبی ـ تەنانەت ئەگەر بیەوێ ـ رەنگە بتوانێ لەبەرامبەر ئەو بەشە لە هاووڵاتانی خۆیدا کە سەر بە ئایین یان مەزهەبێکی دیکەن، نەرمیو لەسەرخۆیی بنوێنێ، بەڵام هیچ کات ناتوانێ کێشەی بەرابەریی تەواوله نێوان ئایینو مەزهەبە جۆراجۆرەکاندا چارەسەر بکا. هەربۆیە ئەگەر دەوڵەتێك بیەوێ مافی مرۆڤ و ئازادیی مەزهەب بەتەواوی وەبەرچاو بگرێو دەستەبەری بکا، تەنیا دەتوانێ دەوڵەتێك بێ کە لەرووی ئایینیوئایدیۆلۆجییەوە بە تەواوی خۆی بێلایەن رابگرێ.

هەروەك گوتمان بێلایەنیی ئایینیو مەزهەبیی دەوڵەت، بە مانای ئەوە نیە دەوڵەت لەبەرامبەر پەسندو بایەخەکانیانو لەنێوچوونی پرەنسیپە ئەخلاقییەکانیاندا کەمترخەم بێ، بەڵکوو لەوە را سەرچاوە دەگرێ کە حورمەت بۆ ئازادیی تەواوی ئایینیو بیروباوەڕەی هەموو هاووڵاتان دادەنێ جا خاوەنی هەر بیرو باوەڕێکی قەلبیو ویژدانی بن. دەوڵەتی دیموکراتیك بە تەواوی خۆی بۆ کاروباری دنیاییو ئەم جیهانییە تەرخان دەکا، تاکوو هەلومەرجی پێویست بۆ پێکەوە ژیانی مرۆڤەکان پێك بێنێ. ئەم دەوڵەتە بەپێی حورمەتێك کە بۆ بیروباوەڕە جۆراوجۆرەکانی هاووڵاتانی خۆی هەیەتی، کاروباری ئاخیرەتو دنیای دیکە بەخۆیان دەسپێرێ. وەبەرچاو گرتنی مافەکانی مرۆڤ بێ وەبەرچاوگرتنی بیروباوەڕو ویژدانیان، بەپێی مافەکانی مرۆڤ ئەرکی دەوڵەتی دیموکراتیکەو هاوکات سنوورەکانی هەقانیەتی ئەم دەوڵەتەش دیاری دەکا. کەوابوو، ئەو پرەنسیپەی مافی مرۆڤ بۆ ئازادیی بەرابەری مرۆڤەکانی سەر بە ئایینە جۆراوجۆرەکان، تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ وەك بنەمایەکی سیستەمێکی حقووقیی دەوڵەتێکی دێموکراتیك دەرکەوێ، کە پلەی حقووقیو سیاسیی مرۆڤەکان بەستراوە بە باوەڕە ئایینییەکانیان نەبێ.



## بەڕێوەبردنی ئیرادەی خەڵك

دیموکراسی لە رووی مانای وشەوە جگە لە حکوومەتی خەڵك مانایەکی دیکەی نیە. ئێمە لە دەستووری هەموو وڵاتانی دێموکراتیشدا بە شێوەی جۆراوجۆر لەگەڵ ئەم فۆرمۆڵە بەرەوروویین کە سەرچاوەی تەواوی هێزی دەوڵەت خەڵکەو خەڵك خاوەنی ئەسڵیی دەسەڵاتە. بەپێی ئەم پێناسەیە تەنیا ئەو سیستەمە دیموکراتیکە هەقانیەتی هەیە کە لە ئیرادەی خەڵکەوە سەرچاوەی گرتبێو جێگەی پەسندی وان بێ.

بیری حاکمیەتی خەڵك لە سەردەمی نوێدا، لەبەرامبەر تێگەیشتنی کۆن لە شێوەکانی فەرمانڕەواییدا سەری هەڵ دا. لەم شێوە کۆنانەدا حکوومەتە ئایینییەکان یان خانەدانە پاشاییەکان خۆیان بە نوێنەری خوا لەسەر زەوی دەزانیو فەرمانڕەوا بوون. دەسەڵاتی دەوڵەت لەسەر بنەمای" پشتیوانیی خوا" بوو و لە کۆمەڵگەوە سەرچاوەی نەدەگرت. گریمانەو گومانی مەزهەبیو میتۆلۆژیانە، تەمێکی پیرۆزی بە دەوری ئەم حکوومەتانەدا پێك دێناو خەڵك دەستیان پێیان رانەدەگەیشت. بیری دیموکراسی لە سەردەمی نوێشدا، راست سێرەی لەو کەلێنەی نێوان دەسەڵاتو خەڵك گرت.

دیموکراسی لە نیهادی دەوڵەتدا دەسەڵاتی ئەو کەسانەی قبووڵ نیە کە لەلایەن هێزێکی غەیبەوە یان میتافیزیکییەوە هەڵبژێردراونو لەسەر تەختی دەسەڵات دانراون. بەڵکوو حکوومەت بە بەرهەمی ئیرادەی خەڵك، واتە بە ویستی ئازادی یەکیەکی تاکەکانی کۆمەڵ دەزانێ. بەپێی ئەم تێڕوانینە شکڵو نێوەڕۆکی دەوڵەت وەك شتێکی لەپێشدا دیاریکراو وەسەرەوەی خەڵك ناکەوێ، بەڵکوو ئەوە خودی خەڵکن کە شکڵو نێوەڕۆکی حکوومەت دیاری دەکەن. بەپێی ئەم مێتۆدە تەنیا ئەو دەوڵەتە شایستەیە کە مەیدانی ئیرادەی خەڵك بێ.

بەڵام لە سیستەمی دیموکراسیدا سەرچاوەگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەت لە خەڵك، بە واتای ئیرادەی موتلەقی خەڵك  و بوونی خەڵك بە تاکە سەرچاوەی مافی کۆمەڵ نیە. لەسیستەمی دیموکراسی دا تەنانەت ئیرادەی خەڵکیش بەستراوە بە بایەخی یەکجاریی

بنەڕەتی واتە هەمان شەئنی مرۆڤ و مافەکانی مرۆڤە. کەوابوو لە دیموکراسییە مۆدێرنەکاندا ئەگەر چی خەڵك خاوەنی ئەسڵیی دەسەڵاتن. بەڵام ئیرادەی وان نابێ بە پێچەوانەی پرەنسیپو بایەخە ئینسانییەکان بەڕێوە بچێ. هەموو مرۆڤەکان خاوەنی ئەو مافانەن کە لەسەرەتای لە دایکبوونیانەوە لەگەڵیانەو بە "مافە سروشتییەکان"یان دەژمێردرێن. لە ئەدەبیاتی پێوەندیدار بە مافەکانی مرۆڤ دا، مافەکانی وەك مافی ژیان، مافی حاشاهەڵنەگری جەستەییو هەروەها ئازادیی تاك بە مافە سروشتییەکانو دووانەی مرۆڤ دانراون. دێموکراسی یان دەسەڵاتی خەڵك ڕێگەی پێ نەدراوە بە دانانی هێندێك قانوونی تایبەتی ئەم جۆرە مافانە بکاتە بابەتگەلێکی وەلانراو. بە واتایەکی دیکە، لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا ئەو مافانەی دانراون، پێوانە نین بۆ مافەکانی مرۆڤ ، بەڵکوو بە پێچەوانە ئەوە مافەکانی مرۆڤن دەبنە پێوانە بۆ ئەو مافانەی دادەنرێن. هەربۆیە ئەو مافە دانراوانەی سێرە لە مافەکانی مرۆڤ دەگرن، پێشەکی خۆیان ناهەقو بێ ئیعتیبار دەکەن.

لە ڕوونکردنەوەی پێوەندیی نێوان دێموکراسیو ئیرادەی خەڵك دا، پرسیارسێك کە دەکرێ بیکەین ئەوەیە کە ئایا سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتی دەوڵەت لە ئیرادەی خەڵکەوەیە بە مانای واقعیی حکوومەتی خەڵكو بەشداریی ئەوان لە هەموو بڕیارە سیاسییەکاندا جۆرێك لە دیموکراسیی ڕاستەوخۆیە؟ وەڵامەکە بێگومان نا یە. هەرچەند ئەم سیستەمە لە شێوە سەرەتاکانی مێژووی خۆیدا نموونەیەك لە دیموکراسیی ڕاستەوخۆی نیشان داوە، بەڵام ئەمڕۆ بە سەرنجدان بە بەربلاویی مەیدانی ئەرکی دەوڵەتانی مۆدێرنو ئاڵۆزیی ئەم ئەرکانە ئیمکانی بەڕێوە چوونی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ نیە. بۆ نموونە یەك یەکی هاووڵاتان ناتوانن لە بڕیارە ئاڵۆزەکانی کاروباری ئابووریو قەزاییو...هتد دا بەشدارو خاوەن ڕا بن. ڕێگەیەك کە دەمێنێتەوە، بەکارهێنانی ئیرادەی خەڵك لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازاد و دەورەیی نوێنەرانی خۆیانە. هەڵبژاردنی ئازاد ڕێگە بۆ دەسەڵاتی خەڵك دەکاتەوە لەگەڵ ئەوەش دا بڕیاردان لە کاروباری پسپۆڕیدا دەخاتە ئەستۆی هەڵبژێراوانی خەڵك. کەوابوو



دەتوانین بڵێین هەڵبژاردنی ئازاد ئامرازی حاکمیەتی خەڵك لە سیستەمێکی دیموکراتیك دایە. بەم جۆرە ئەمڕۆ دیموکراسییەکی مۆدێرن، ئیدی نەك بەمانای حکوومەتی خودی خەڵك، بەڵکوو وەك حکوومەتی نوێنەرانی خەڵك دەتوانێ وەدی بێ. نوێنەرانێك کە لە هەڵبژاردنێکی ئازاد، گشتیو دەورەییدا لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن تاکوو کاروباری وڵات بە گوێرەی ئیرادەی وان بەرەوپێش بەرن.

کارول پوپێر فەیلەسووفی سەدەی بیستەمو ئینگلیزی زمانی خەڵکی نەمسا، لە دیاریکردنی پێوانەیەکی دروست بۆ جیاکردنەوەی سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکان لەیەکتر، گوتبووی کە پێوانەیەکی ئەوتۆ ئەو پرسیارەی ئەفلاتوون ناگرێتەوە کە کێ دەبێ حکوومەت بکا، بەڵکوو لەسەر ئەو پرەنسیپە سەرەکییە دامەزراوە کە لەکام سیستەمێکی سیاسیدا دەکرێ حکوومەتێکی خراپو نالایەق بەبێ خوێنڕشتن وەلا بنرێ؟ بە واتایەکی دیکە کێشەکە تەنیا لەسەر چاكو خراپ یان لێوەشاوەو نالێوەشاوەیی دەسەڵاتداران نیە، بەڵکوو وەدەستهێنانی ڕێوشوێنێکی ئەوتۆیە کە تەنانەت ئەگەر سیاسەتمەداری نالێهاتووش بە دەسەڵات بگا، ئیمکانی لابردنی ئاشتیخوازانەی وی لە دەسەڵات دەستەبەر بکا.

دەتوانین بڵێین لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا، پرەنسیپی هەڵبژاردنی ئازاد، نوێنگەی ئەم ڕێوشوێنەیەو ئەو سیستەمە حکوومەتییەی بیەوێ خاوەنی ئەم هەقانیەتو ئیعتیبارە بێ، هیچ ڕێگەیەکی جگە لە مل ڕاکێشان بۆ دەنگی خەڵكو ملدان بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی گشتیو ئازادو دەورەیی نیە. هەڵبژاردنی ئازاد، بە واتای پێکهێنانی ئیمکانی شانسی وەك یەك بۆ هەموو هاووڵاتان، بەمەبەستی بەشداری لە چارەنووسی سیاسیو قبووڵکردنی بەرپرسایەتی لە چارەسەری ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان دایە. حوکمی "شانسی وەك یەك" پێویستیی بەوەیە کە هیچ هاووڵاتێك لە مافی هەڵبژاردنو هەڵبژێران بێبەش نەبێو هیچ کەس بە هۆی باری ڕەگەزی، قەومی، بیروباوەڕەوە دەرناوێژرێ. بۆ بەشداری لە هەڵبژاردنێکی ئازادو گشتی دا هیچ کۆسپێك جگە لەرادەی تەمەن ـ کە ڕادەکەی دبێ ڕەزایەتیی کۆمەڵی

لەسەر بێ ـ ئیعتیباری نیە. هەر هاووڵاتێك تەنیا خاوەنی یەك دەنگەو رادەی ماڵودارایی یان بوونی پێگەیەکی تایبەتیی کۆمەڵایەتی، بۆ هیچ کەس مافێکی تایبەتیی لەگەڵ نیە.

گوتمان کە لە کۆمەڵدا کێشەیەکی بەردەوام لە نێوان عەلاقەو بیروباوەڕە جۆراوجۆرەکاندا لە گۆڕێ دایە. لەراستیدا تایبەتمەندیی کۆمەڵگەی فرەچەشنی پێویستیی بەوە هەیە کە شوێنەوارێك لە تاکە ئیرادەیەکی خەڵکیو جیهانبینییەك نەبێ. کەوابوو ئەوەی لە سیستەمێکی دیموکراتیك دا وەك ئیرادەی خەڵك دەچێتەسەر، دیارە ئیرادەی زۆربەی خەڵکە نەك ئیرادەی هەموو کۆمەڵ. پرەنسیپی "حکوومەتی زۆربە" لە سیستەمی دیموکراتیکدا، لەم راستیو پێویستییە کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوەی گرتوە.

هەر لەم کاتەشدا دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە هەڵبژاردنی ئازاد لە خۆیدا دەستەبەری باشترین حکوومەت نیە، بەڵام تەنیا رێگەیەکە دەتوانێ بە وەبەرچاو گرتنی پرەنسیپی دادپەروەرانەی زۆرایەتیو کەمایەتی، ئاشتیو ئارامیی کۆمەڵایەتی دابین بکا. لەلایەکی دیکەوە خولاسە کردنەوەی دیموکراسی لە "حکوومەتی زۆرایەتی" دا هەڵەیە. دەوامو راوەستاویی دیموکراسی، بە وەبەرچاوگرتنی مافی کەمایەتییش هەڵدەسەنگێندرێ. لەهەر دیموکراسییەکی راستەقینەدا، کەمایەتی دەبێ ئەو شانسەی هەبێ ببێتە زۆرایەتی.

بەسەرنجدان بەو تێبینیانەوە دەتوانین بڵێین کە هەڵبژاردنی ئازاد تەنیا رێگەیەکە دەرفەتی کەمکردنەوەی کێشە کۆمەڵایەتییەکانو رێگەچارەی بە دوور لە توندوتیژیی کێشە سیاسییەکان پێك دێنێ. هەڵبژاردنی ئازاد متمانەبەخشترین پاڵپشتە کە دەتوانێ خاڵە هاوبەشەکانی مرۆڤ لە رووی سیاسییەوە یەك بخاو رێبەری بکا.

بەڵام بۆ بەجێهێنانی پێویستییە دیموکراتیکییەکانی کۆمەڵ، دەبێ هەڵبژاردنی گشتیو ئازاد دەستەبەری بەڕێوەبردنی پێویستیشی هەبێ. هەرچەشنە زۆرەملییەك بۆ بەلایەکدابردنی دەنگەکانی خەڵك، سلامەتیی هەڵبژاردن دەخاتە مەترسییەوە. لێرەدا مەبەست بانگەشەی سیاسی بە مەبەستی راکێشانی دەنگەکانی خەڵك ـ کە لە



هەڵبژاردندا شتێکی زۆر بەرهەقو رەوایە ـ نیە، بەڵکوو قسە لەسەر بڕیاردانی ئازادانەو سەربەخۆی خەڵك لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی خۆیانە.

سەبارەت بەوە کە کاری سیاسی بەردەوام بەرەو داهاتوویەکی کراوە دەچێتە پێش، هەمیشە بارێك لە نامتمانەیی و ئاکامی چاوەڕوان نەکراوی لەسەر شانە. کێ دەتوانێ بە دڵنیاییەوە بڵێ کە ئەم یان ئەو کردەوە سیاسییە بۆ قازانجی داهاتووی کۆمەڵگە لە یەکی دیکە باشترە؟ یان هەر لەجێ دا کێ دەتوانێ تەواوی قازانجەکانی کۆمەڵگە بە یەکجاریو بۆ هەتاهەتایە پێناسە بکا، مادام کە نازانێ چ داهاتوویەکی مێژوویی لە پێشە؟ راست هەر لەبەر ئەم بێ ئاگایی لە داهاتوویەیە کە دەبێ لە کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیکدا، مەسەلە بنەڕەتییەکانی سیاسەت جاربەجار سەرلە نوێ بخرێتەوە بەر ڕای گشتی رێگە بۆ بڕیاری ئیرادەی زۆربەو هاوکات لەگەڵ ئەمەش وەبەرچاو گرتنی مافی کەمایەتی بکرێتەوە.

## ئازادیی حیزب و رێکخراوەکان

چاوخشاندنێك بەسەر ژیانی سیاسیی سیستەمە دیموکراتەکاندا دەری دەخا کە ناکرێ پێوەندیی نێوان هەڵبژێرو هەڵبژێرراوەکان تا ئاستی هەڵبژاردنی گشتیو دەورەیی بێتە خوار. ئەگەر بڕوانینە رۆڵی حیزبو رێکخراوە سیاسییەکان، یەکیەتیو ئەنجومەنە گەلییەکان، بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانو بە کورتی ژیانی پڕ لەهەلبەزدابەزی کۆمەڵگەی مەدەنی لە کۆمەڵگە دیموکراتیکەکاندا، ئاڵۆزیی ئەم پێوەندیانەمان زیاتر بۆ روون دەبێتەوە.

هاووڵاتی کۆمەڵگەی دیموکراتیك لە رێگەی ئەم رێکخراوانەوە کە باسیان کرا دەتوانێ بێتە نێو ژیانی سیاسییەوەو کار بکاتە سەر بڕیارەکانی. بە واتایەکی دی، رێکخستنی سیاسی، لۆسەیەکت دەداتە دەست تا بتوانی بە هۆی ئەوەوە و لە هەوڵی هاوبەش لەگەڵ هاوفکرەکانی خۆتدا بتوانی لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا بەسەر کەندوکۆسپە تایبەتییەکانی خۆتدا زاڵ بێ. کەوابوو، دەتوانین حیزبو رێکخراوە

سیاسییەکان بە ئامرازی بەکارهێنانی ئیرادەی سیاسیی هاووڵاتان دابنێین. ئەم ڕێکخراوانە نوێنەرانی گرووپە جیاوازەکانی کۆمەڵن کە لە ڕێگەی شوێندانان لەسەر ئاستی گشتیو فشار خستنە سەرحکوومەتەکانو پارلمانەکان، ویستو داخوازەکانی تاکەکان بەیان بکەن. بۆیە دەبێ ئازادیی تێکۆشانی حیزبو ڕێکخراوە سیاسییەکان بە یەکێکی دیکە لە پێش مەرجەکانو تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دیموکراتیك دابنێین.

دۆزینەوەی گونجانو ڕێککەوتن لە نێوان عەلاقە جۆراوجۆرەکانی خەڵکدا، بەبێ بەشداریی گرووپە سیاسییەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا وەدی نایە. سیستەمێك کە زەمینە بۆ بەشداریی خەڵك لە پێکهێنانی دەوڵەت لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازاددا پێك دێنێ، ناتوانێ هەر لەگەڵ ئەمەشدا ئەوان لە دەستڕاگەیشتن بە ئامرازی کاریگەر بۆ بەشداری لە کاروباری سیاسیدا بێبەش بکا. شتێکی وا کارێکی زۆر نەگونجاوە.کەوابوو هەڵبژاردنی ئازادو ئازادیی تێکۆشانی حیزبە سیاسییەکان لە پێویستییەکانی یەکترن.

ناوەندەکان، ئەنجومەنەکانو داهێنانەکانی هاووڵاتان، نوێنەری خەڵك لە پێداگری لەسەر ئامانجە تایبەتییەکانیانن و دەکرێ ئەمانە وەك باسکی بەهێزی هاووڵاتان لە سووربوون لەسەر ویستوداخوازەکانیانو بەخشینی وزە بە تاك لە بەرامبەر دەسەڵاتو هەیبەتی دەوڵەتدا سەیر بکرێن. شانبەشانی ئەمانە حیزبە سیاسییەکان هەن کە مەکۆی دڵخوازانەی تاکەکانن لە پێناوی بەشداری لە ژیانی سیاسیداو خستنە رووی ڕێگەچارە بۆ چارەسەری گیروگرفتو کێشە کۆمەڵایەتییەکان، لە دەوری بەرنامەیەکی هاوبەش کۆ بوونەتەوە. ئەمڕۆ هیچ دیموکراسییەکی مۆدێڕن نیە کە ئازادیی تێکۆشانی حیزبە سیاسییەکان وەك ئامرازی بەڕێوە بردنی ئیرادەی سیاسیی گرووپە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتیی تێدا دەستەبەر نەکرابێ.

ئامانجی حیزبی سیاسی، گەیشتن بە دەسەڵاتە بۆ وەدیهێنانی بەرنامەکانی خۆی،و گۆڕینی پتانسیەلی ئامانجە دیاریکراوە سیاسییەکانی بۆ پراکتیزە کردنیانە. بەم جۆرە دەکرێ حیزبە سیاسییەکان بە وتەبێژی سیاسیی گرووپە جۆراوجۆرەکانی خەڵك بزانین.



ئەمانە لەلایەك بیروبۆچوونو تێڕوانینە سیاسییەکان و لە لایەکی دیکەوە داخوازەکانی خەڵك لە خۆیاندا کۆ دەکەنەوە تاکوو پاشان لە ڕقەبەرایەتیی سیاسیدا دیارە بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات، لە نیهادەکانی دەوڵەتدا وەدی بێنن. بەبێ ئازادیی تێکۆشانی حیزبەکان، باس لە بەشداریی خەڵك لە کاروباری سیاسیدا باسێکی بێمانایە. کۆمەڵگەی فرەچەشن تەنیا دەتوانێ لە بوونی حیزبە سیاسییەکاندا توانای کردەوەی سیاسیی هەبێ. تەنیا لە ڕیگەی حیزبەسیاسییەکانەوەیە کە هەڵبژێنەران واتە خەڵك دەتوانن ئیرادەی سیاسیی خۆیان بەراستی بەرنەسەر. کەوابوو، حیزبە سیاسییەکان لۆسەیەکن خەڵك بە هۆی ئەمانەوە جێگەی دەسەڵات دەگرنەوە تا لەم ڕێگەیەوە بەرنامەو بڕیارە سیاسییەکانی خۆیان بە کردەوە بەڕێوە بەرن.

هەروەك گوتمان، لە مەسەلە چارەنووسسازە سیاسییەکاندا، بەردەوام کردەوەکان بەرەو داهاتوو دەچنە پێش، ئەو داهاتووەی دەستنیشانکردنی وردی هەمەوو لایەنەکانی ئیمکانی نیە. هەروەها دەبێ بگوترێ لە سیاسەتدا زۆر بەکەمی دەکرێ تەنیا وەڵامێکی ڕوونو ئاسان بە پرسیارە ئاڵۆزو دژوارەکان بدرێتەوە. ئەم ڕاستیانە پێویستیی ئازادیی حیزبەکانو ڕقەبەرایەتیی سیاسیی نێوانیان زیاتر بەرجەستە دەکاتەوە. مناقشەی حیزبەکان لەسەر بنەمای پرەنسیپەکانی دیموکراسی لە جێگەیەکدا دەگووڕێو گەشە دەکا کە کۆمەڵگەی فرەچەشن بتوانێ لە ڕێگەی قازانجو عەلاقە ڕێکوپێك کراوەکانەوە لە ڕووی سیاسییەوە زیندووو ئەکتیڤ بمێنێتەوەو بەهۆی لۆسەی حیزبەکانەوە حاکمیەتی خەڵکو هەڵبژاردنی کاربەدەستانی خۆی وەدی بێنێ، ئەو حیزبانەی کە بە ئازادی دامەزراونو لەگەڵ خاڵە سەرەتاییەکانی سیستەمی دیموکراسی یەك دەگرنەوە.

## ئۆپۆزیسیۆن یان ئاڵتەرناتیڤی سیاسی

لە تێڕوانینی قووڵ بۆ داڕشتنی گەڵاڵەی دەوڵەتی دیموکراتیکدا، دوو بۆچوونو ئەزموونی بنەڕەتی، پێویستیی بوونی ئۆپۆزیسیۆن وەك جێنشینی حکوومەتیان سەلماند: یەکەم ئەوە کە دیموکراسی توانای گەشەکردنی خۆی لە کێشە ساسیو کۆمەڵایەتییەکان

وەردەگرێ. دووهەم ئەوە کە پاوانکردنی دەسەڵات، ئاکامەکەی گەندەڵییە و دەبێ بە هۆی ڕێگە چارەیەکی ڕێکوپێك لە کۆنترۆڵ کردنی دەسەڵاتدا ـ کە یەکێك لەمانە تێکۆشانی ئۆپۆزیسیۆن وەکوو لایەنێك لە بەرامبەر هێزی حکوومەت دایە ـ لەبەرامبەر ئەم مەترسییە دا بەربەرەکانی بکرێ.

بیرمەندانی سیاسیی سەدەی هەژدەهەمی ئورووپا، باوەڕیان وابوو کە حکوومەتو ئۆپۆزیسیۆن لە کێشەی هەبوونو نەبوونی دەسەڵاتدا، لە رووی ئەخلاقییشەوە لێك جیان. هەڵخلیسکانو بەرەو گەندەڵی زیاتر هەڕەشە لەو کەسانە دەکا کە دەسەڵاتیان بەدەستەو ئۆپۆزیسیۆن هێزێکە کە دەبێ لە بەرامبەر ئەم مەترسییەدا راوەستێ. لە ڕێگەی نیهادینە کردنی ئۆپۆزیسیۆنەوە دەبێ ئازادی دەستەبەر بکرێو ئەم کارە ئەوکاتە دەکرێ کە سروشتی گەندەڵ پەسندی مرۆڤ بەتایبەتی دەسەڵاتداران بە هۆی پارسەنگێکی سیاسییەوە کۆنترۆڵ بکرێ، تا بەم جۆرە ئازادی نەبێتە سەرەڕۆیی‌و کەس بەکەسی.

بەم جۆرە لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا، لە پەنا حکوومەتی هەڵبژێردراوی خەڵکدا، ئۆپۆزیسیۆن دووهەمین لۆسەی بزوێنەری سیاسی لە کۆمەڵگەدایەو پێش بەوە دەگرێ کە حیزب یان هێزی دەسەڵاتدار، هوییەتی خۆی لەگەڵ هوییەتی دەوڵەت لێ تێك بچێو سیاسەتەکانی خۆی بە شێوەی موتڵەق بە ئیعتیبار رابگەیەنێ. لە راستییشدا لە سیستەمێکی پارلمانی‌دا سنووری مەودای سیاسیی نێوان حکوومەتو پارلمان یان بە واتایەکی دی دەسەڵاتی بەڕێوە بردنو دەسەڵاتی یاسادانان دیاری ناکرێ، بەڵکوو ئەم سنوورە زیاتر لە نێوان حیزب یان ئیئتیلافی حیزبە دەسەڵاتدارەکان لە لایەك و حیزبە کانی ئۆپۆزیسیۆن لە لایەکی دیکە دایە. بەم جۆرە لە پەنا شێوە کلاسیکییەکانی سەربەخۆیی دەسەڵاتەکاندا ـ کە لە درێژەی باسەکەدا ئاماژەی پێ دەکەین ـ ئەمرۆ شاهیدی سەربەخۆیی هێزە زیندووەکانی دیکەش لە سیستەمە دیموکراتیکەکاندایین.

دیارە نابێ بایەخێکی زۆر بە ئەگەری کۆنترۆڵی دەسەڵات لە لایەن ئۆپۆزیسیۆنەوە بدرێ. ئۆپۆزیسیۆن بە هۆی نەبوونی زۆرایەتی، کەم وایە لە پارلماندا قسەی خۆی



بباتە سەر. بەڵام ئەوەی کە لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا رۆڵی ئۆپۆزیسیۆن زەق دەکاتەوە، هەر ئەو کارەیە کە ئەم هێزە دەتوانێ بەهۆی رەخنە گرتن لە کەموکوڕییەکان لە ئاستی گشتیدا ئەنجامی بدا.

لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر ئۆپۆزیسیۆن بیەوێ کاریگەرییەکی واقعیی هەبێ، دەبێ خاوەنی مافی پاڕلمانی‌و مەیدانێکی بەربڵاو بێ. هەروەها دەبێ ئوپۆزیسیۆن لە مەیدانی هەڵبژاردنیشدا خاوەنی شانسی یەکسان بێو بتوانێ کەڵك لە ئیمکاناتی دەوڵەتی‌و هۆیەکانی راگەیاندنی گشتی وەرگرێ لە بانگەشە بۆ بۆچوونەکانی خۆی لە نێو بیروڕای گشتیدا. وەبەرچاو نەگرتنی ئەم پرەنسیپانە، ئۆپۆزیسیۆنی پارلمانی دەکاتە " ئۆپۆزیسیۆنی سیستەم". ئۆپۆزیسیۆنی سیستەم دەکەوێتە دژایەتی لەگەڵ بنەماکانی دەستوورو ئەمەش مانایەکی دیکەی جگە لە رووخاندنی بناخەکانی سیستەمی دیموکرات نیە. دیموکراسی ناتوانێ لەگەڵ شتێکی ئەوتۆ بگونجێ. ئەو سیستەمەی بەر بە تێکۆشانی ئۆپۆزیسیۆن دەگرێ، ژیانی سیاسیی کۆمەڵگە تووشی قەیران دەکاو زەمینە بۆ سەرهەڵدانی ئۆپۆزیسیۆنی توندڕۆ پێك دێنێ، واتە هێزێك کە ئامانجەکەی نەك وەلانانی حیزبو هێزی حکوومەتی، بەڵکوو، وەلانانی حکوومەت بە گشتییە. بەڵام دیموکراسی کەشوهەوایەکی ئەوتۆ دەستەبەر دەکا کە مەجال بە گۆڕانی حکوومەت دەدا لە چوارچێوەی ئەو پێوەندیانە دا کە هەن.

دیموکراسی پێویستیی بە ئۆپۆزیسیۆنی قانوونی لە نێو پارلمانو دەرەوەی پارلماندا هەیە، ئەمە پێوانەیەکە بۆ ئازادی‌و رەوابوونی سیستەمێکی سیاسی. تەنیا لە پانتای پڕ لەکێشەی پێکەوە ژیانو ململانەی نێوان حکوومەتو ئۆپۆزیسیۆندایە کە سیاسەتی دیموکراتیك گەشە دەکا. ئۆپۆزیسیۆن نەك هەر پێویستیی بە ئازایەتی‌و توانای بیرکردنەوە( هەیە) بەڵکوو پێویستیی بە کەشوهەوایەکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆ هەیە کە حاشا لە کێشەو ململانیی سیاسی نەکاو بەهۆی ئۆتۆریتەیەکی درۆیی جێگەیەکی تایبەتی نەدا بە حکوومەتو هەرچەشنە رەخنەگرتنێك بە دوژمنایەتی‌و تێکدان حیساب نەکا.

دێموکراسی بەردەوام پێویستیی بە هەوای نوێ هەیە. ئەم هەوا نوێیە جگە لە ئاوەڵا راگرتنی کەشوهەوای کۆمەڵایەتیو خستنە رووی ئاسۆیەکی روون بۆ ریفۆرمو ئاڵوگۆڕ شتێکی دیکە نیە. دەستەبەری تێکۆشانی ئازادو قانوونیی ئۆپۆزیسیۆن لە سیستەمێکی سیاسیدا نیشانەی پێشوازی لەم کەشوهەوا ئاوەڵاو ئاسۆ روونەیە.

## ئازادیی بیروباوەڕو دەربڕین

پێمان لەسەر ئەوە داگرت کە دیموکراسی ئاکامی وێککەوتنی بۆچوونەکانو ململانەی بیروباوەڕە زیندووەکانە. سیستەمی دیموکراتیك لە هەموو بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا پێویستیی بە کەشوهەوایەکی وا هەیە کە دەرفەتی مناقشەی ئازاد لە نێوان بۆچوونو بیروباوەڕە جۆراوجۆرەکاندا پێك بێنێ. دەربڕینی بیروباوەڕی تایبەتیو پرسیار لە هۆو چۆنیەتیی کاروبارەکان، دەبێ ئازاد بێو تەحەممول بکرێ. کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ لە رێگەی بەڵگە هێنانەوەیەکی عەقڵی دیاری بکرێن نەك لەرێگەی فەرمانو رێنوێنیی بێئەملاو ئەم لاوە. هیچ کردەوەیەك نابێ لە بازنەی رەخنە بچێتە دەرو خۆی لە لێپرسینەوەو هەڵسەنگاندن قوتار بدا.

ئەمە لە بنەماکانی دیموکراسییە کە تەنیا لە رێگەی ململانەی رووحیی بەردەوام لە نێوان هێزو عەلاقە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانەوە بیرو ئەندێشەی سیاسیی ڕاست بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێك لەسەر بنەمای چاکەو مەسڵحەتی گەشتی دەخولقێ. دیارە ئەمە قەت بەو مانایە نیە کە لەم رێگەیەوە هەمیشە ئاکامێکی باش دەست دەکەوێ، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە رێگەی دیموکراسی، رێگەی نەبڕاوە یان کارول پۆپێر گوتەنی رێگەی دەربازبوونێکی بێ کۆتاییە بۆ ئەزموونو هەڵە. هەر لەم کاتەشدا رێگەیەکە کە بە هۆی کۆنترۆڵو رەخنەی بەردەوام متمانەیەك بۆ وەدەستهێنانی تارادەیەك باشترین پرۆگرامی سیاسی دەخاتە روو.



لە سیستەمی دیموکراسیدا ئەرکی کۆنترۆڵو رەخنە تەنیا لە ئەستۆی ئۆپۆزیسیۆنی پارلمانی نیە. بەڵکوو هەر لەجێدا لە ئەستۆی تێکڕای خەڵکە. ئازادیی راگەیاندن و هەواڵ بۆ هەر کەسێك ئەو دەرفەتە پێك دێنێ تاکوو لە پێکهێنانی بیروڕای گشتیدا بەشی تێبکەوێ. چەمکی بیروڕای گشتی هەر لەم کاتەدا بەو مانایەیە کە لە پانتای خۆیدا، نەك بابەتە کەسییەکان بەڵکوو بابەت گەلێك کە پێوەندیان بە ژیانی بە کۆمەڵەوە هەیە، دێنە بەر باس. کەوابوو هەموو هاووڵاتانو ئەنجومەنە هاووڵاتیەکان کە خۆیان بە فکرو بەرژەوەندییەکانی گشتییەوە خەریك دەکەن، وپاشان ئەم بیرو بۆچوونانە لە شێوەی رەخنەو دژایەتی یان پێشنیارو رەزامەندی لە کۆمەڵگەدا دێننە گۆڕێو لەم رێگەیەوە شوێن لەسەر پێکهێنانی ئیرادەی سیاسی لە کۆمەڵگەدا دادەنێن، بیروڕای گشتی دروست دەکەن. ئەو بیروڕا گشتییەی بەسەرنجدان بە فرەچەشنیی کۆمەڵگە، بۆخۆی ناتوانێ یەکدەست یەك چەشن بێ.  ئازادیی بیروباوەڕ لە سیستەمێکی دیموکراتدا ، تەنیا بە مانای هەبوونی ئازادیی بوونی بیروباوەڕی تاك نیە، بەڵکوو بەر لە هەر شتێك بە مانای ئیمکانی دەربڕینی ئەم بیروباوەڕیە. لە راستیدا هیچ کەس ناتوانێ پێشی سەرهەڵدانی بیروباوەڕی کەسیی تاکەکان بگرێ، مادام کە ئەم بیروباوەڕە بواری کەسیان بەجێ نەهێشتوە. کەوابوو ئازادیی بیروباوەڕ لە دیموکراسیدا، دیارە بە مانای ئیمکانی دەربڕینی ئازادی ئەم بیروباوەڕیە، بە واتایەکی دی راگواستنی لە ئاستی تاکەوە بۆ پانتای گشتی. هەربۆیە ئازادیی ئەندێشە لەگەڵ ئازادیی دەربڕین، ئازادیی هەواڵ زانیاری، ئازادیی چاپەمەنی کۆبوونەوەو ئەنجومەنەکان پێوەندییەکی نەپچڕاوی هەیەو بەهۆی ئەم مافەوەیە کە دەبێتە شتێکی جێگەی باس. کەوابوو لە سیستەمێکی سیاسیدا تەنیا ئەو کاتە دەتوانی باسی ئازادیی بیروڕای واقعی بکەی کە تاك بتوانێ لە پێکهێنانی بیروڕای گشتیدا بەکاری بێنێ.

ئازادیی چاپەمەنیو هۆیەکانی راگەیاندن تەنیا لە رێگەی هەڵگرتنی سانسۆری دەوڵەتییەوە دەستەبەر نابێ. دەبێ نیهادە گشتییەکان لەسەر هەست بن کە بیروباوەڕێکی تایبەتی بەسەر کۆمەڵگەدا زاڵ نەبێ. شانبەشانی ئەمە، دەبێ راگەیەنە گشتییەکانو

هۆیەکانی ڕاگەیاندن بە کەڵك وەرگرتن لە داڕشتنی پەیڕەوە نێوخۆ دیموکرتیکەکان، لە ریزەکانی خۆیاندا لە دژی پاوانخوازیی فکری ڕاوەستن. ئەم مەسەلەیە ئەمڕۆ لە سەردەمی ئینفۆرماتیك و پێوەندییە بەربڵاوەکانی جیهاندا گرنگییەکەی سەد بەرابەرە.

لە سیستەمی دیموکراتیکدا هەرکەس بیەوێ کەڵك لە ئازادیی بیروباوەڕی خۆی وەرگرێ، دەبێ دەرفەتی کەڵك وەرگرتن لە زانیارییەکانی هەبێ. قەزاوەت لەسەر کاروبارەکان ئەو کاتە سەر دەگرێ کە مرۆڤ لە چۆنیەتییەکەی ئاگادار بێ. سیستەمێك کە گەشەکردنی بیری هاووڵاتانی خۆی بە هیند وەردەگرێ‌و بە خاوەنی سەرکیی دەسەڵاتیانی قبووڵە، دەبێ ئەوان لەو بڕیارە سیاسیانەی کە بەڕێوەن ئاگادار بکاتەوە. ئەم شتە لایەکی دیکەی ئازادیی بیروباوەڕ لە سیستەمی دیموکراتیکدایە. تەواوی ئەو مەسەلانەی پێوەندیان بە عەلاقەو بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە هەیە، و هەبوونی زانیاری لەبارەی ئەم مەسەلانەوە، مەرجی پێشوەختی قەزاوەتی سیاسی لەبارەی وان دایە، دەبێ لە ئاستی گشتی داو لە ڕێگەی هەواڵ‌و زانیاریی ئازادەوە، بخرێنە بەر باس وتووێژەوە. ئەمڕۆ لە کۆمەڵگە دیموکراتیکەکاندا، باس لە دەسەڵاتی بیروڕای گشتی دەکرێ. ئەم دەسەڵاتە مانایەکی جگە لەوە نیە کە کاری سیاسی لە بازنەی بەرتەسکی کاربەدەستان دێتە دەرو دەکەوێتە ژێر چاوەدێریی بیروڕای گشتییەوە. بیروڕای گشتی دەبێ حاکم بێ تا بە یارمەتیی عەقڵی بە کۆمەڵەوە، ڕێگە لە سەرەڕۆیی‌و پاوانخوازی بگیرێ.

## جیا کردنەوەی دەسەڵاتەکانی دەوڵەت

باسی ئازادیی حیزبەکان، کاریگەریی ئازادیی ئۆپۆزیسیۆن‌و ئازادیی بیروڕا دەربڕین، وەکوو لۆسەی کۆنترۆلی دەسەڵاتی دەوڵەت و سەرچاوەی بەشداریی سیاسیی کۆمەڵگەمان کرد. بەڵام دەبێ ئەوەش زیاد بکەین کە کۆنترۆڵی واقعیی دەسەڵات ئیمکانی نیە، بەتایبەتی ئەگەر هەموو دەسەڵات لەبەر دەستی کەسێك یان نیهادێك دابێ. بیرمەندانی سیاسیی سەردەمی ڕۆشنگەری لە ئورووپادا، سەلماندیان کە کۆنترۆڵی دەسەڵات بە شێوەیەکی کاریگەر تەنیا لە ڕێگەی خودی دەسەڵاتی



دەوڵەتییەوە دەکرێ وەدی بێ. شارول مۆنتسکیۆ ڕۆشەنگەری فەرانسەیی لە سەدەی هەژدەیەمداو باوکی رووحیی بیری جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، دەوڵەتی بە خاوەنی سێ ئەرکی سەرەکی دەزانی: کاروباری قانوون دانان، کاروباری بەڕێوەبردن‌و کاروباری قەزایی. هەر ئەویش پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە هەموو دەسکەوتە سیاسییەکانی کۆمەڵگە بە فیڕۆ دەچن ئەگەر هەموویان لەبەر دەستی کەسێك یان نیهادێکدا کۆ بکرێنەوە. کەوابوو هەر سیستەمێکی سیاسی بە مەبەستی دەستەبەری ئەرکی ئازادیی خۆی، دەبێ دەسەڵاتە دەوڵەتییەکان لە نێوان ئۆرگانە جۆراوجۆرو سەربەخۆکاندا دابەش بکا. بەجۆرێك ئەم ئۆرگانانە بتوانن چاوەدێریان بەسەر یەکتر داهەبێ و یەکتر کۆنترۆڵ بکەن‌و پێش بە لە پاوانخرانی دەسەڵات بگرن.

لە ئەندێشەی مۆنتسکیۆدا هاندەری سەرەکیی دابەشکردنی دەسەڵات لەسەر ئەم ئەزموونە دنرابوو کە هەر خاوەن دەسەڵاتێکی سیاسی، بەردەوام تووشی ئەفسوون‌و خراپ کەڵکوەرگرتن لە دەسەڵات دەبێ. هەربۆیە دەبێ دەسەڵاتی سیاسی بەرتەسك‌و دابەش بکرێ. بیری مۆنتسکیۆ لەبارەی سنووردارکردنی دەسەڵاتی پاشایەتیی موتلەق دابوو. پارلمان وەکوو پارسەنگێکی سیاسی لە بەرامبەر پاشایەتیی موتلەقدا، دەبووا دەسەڵاتی قانووندانانی لە دەستی حاکمی موتلەق دەرهێنابایەو درابا بە نوێنەرانی خەڵك. لە رەوتی دیموکراتیزە بوونی کۆمەڵگەی ئورووپادا، وردە وردە بیرۆکەی حاکمیەتی خەڵك زاڵ بووو لەژێر تیشکی ئەمەدا پاشایەتی‌و هەقانیەتی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرییەکەی کەم رەنگ بۆوە. پاشاکان بایەخی سیاسیی خۆیان لەدەست دا،و پارلمانەکان جێگەی ئەوانیان گرتەوە. بەم جۆرە جیاکردنەوەی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری‌و دەسەڵاتی قانووندانان دژوارتر بووو بەشێوەی سوننەتی لەنێو چوو و ڕۆڵی ئۆپۆزیسیۆنی نێو پارلمان، وەکوو توخمێکی نوێ لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا زەق بۆوە.

بەڵام رووحی دابەشکردنی دەسەڵاتە دەوڵەتییەکان بەسەرئەم سێ دەسەڵاتەدا کە مۆنیسکیۆ باسیان دەکا، تەنانەت ئەمڕۆش لەسەرەتای سەدەی بیست‌ویەکەمدا، بەسەر بیری سیاسیی دیموکراسییەکانی ڕۆژئاوا دا زاڵە. دیارە لە زۆربەی دیموکراسییە

مۆدێرنەکاندا کە لایەنی پارلمانتاریستیەکەیان زاڵە، سەبارەت بەوە کە حیزب یان حیزبە ئیئتیلافییەکان کە زۆرایەتیی پارلمان پێك دێنن، وێکرا حکوومەت پێك دێنن، چوارچێوەی قانووندانانو بەڕێوەبردن ئیدی بە دیواری چینیش لێك جیا ناکرێتەوەو جیاکردنەوەی پێرسۆنێلی ئەم دوو بەشە بە شێوەی کلاسیکی ئیدی عەمەلی نیە. بەڵام لەو دیموکراسیانەدا کە لایەنی سەرکۆماری( پرزیدیال)یان زاڵە، کەلێنی نێوان دەسەڵاتی بەڕێوەبردنو قانوون دانان قووڵترەو پارلمان لە بەرامبەر حکوومەتدا سەربەخۆیی زیاتری هەیە. بەڵام ئەوەی لە هەردووی ئەم شێوە دێموکراسییەیدا باسیان کرا گرنگە، و لە کاری جیاکردنەوەی دەسەڵاتە دەوڵەتییەکاندا تا ئێستاش پتەو بوونی خۆی هەروا پاراستوە، دیارە جیاکردنەوەی روونو ئاشکرای دەزگای قەزایی لە نیهادە دەوڵەتییەکانی دیکەیە. جگەلەوەش، چوارچێوەی سەربەخۆی قەزایی لە رەوتی مێژوویی خۆیدا، دەسەڵاتێکی بەربلاوتری وەرگرتوە، کە دەتوانین نوێنگەی ئەمە لە دادگای بەرز تایبەت بە پێڕاگەیشتن بە کێشەکانی سەرچاوە گرتوو لە لێکدانەوەی دەستوور لەم جۆرە ولاتانەدا ببینین.

دەورەیی بوونی هەڵبژاردنیش لە ولاتانی دیموکراتدا، بۆخۆی بەجۆرێك هەڵگری توخمی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانە. بەو مانایە کە دەسەلات نەك هەر لەنێو نیهادە دەوڵەتییەکاندا بەڵکوو لە رووی کاتییشەوە دابەش دەبێ. لە هێندێك لە ولاتانی دیموکراتیکدا پۆستی سەرکۆماری تەنیا بۆ دوو دەورە دەدرێتە کەسێك. یان پارلمانەکان ئەوپەڕەکەی بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن. ئەم رێگە چارەیە نیشاندەری حوزووری بەهێزی بیروڕای گشتی لە کاری هەڵبژاردنی نوخبە سیاسییەکان دایە، کارێك کە بۆخۆی نیشانەی بەشداریی خەڵك لە دابەشکردنی دەسەلات دایە.

لەم تێبینیانەی سەرەوەڕا دەتوانین لەوە بگەین کە لە دیموکراسییە مۆدێرنەکاندا هەرچەند دابەشکردنی دەسەڵاتە دەوڵەتییەکان ئیدی بە شێوە کلاسیکییەکەی نەماوە، بەڵام سەرهەڵدانی توخمی نوێی وەك هەڵبژێنەران، بیروڕای گشتی، هێزە رێك خراوەکان لە شێوەی حیزبو رێکخراو داو حوزووری ئۆپۆزیسیۆن، مەترسیی لە پاوانخرانی دەسەلات لەم کۆمەڵگەیانەدا نامێنێ. هەموو ئەو هێزانە بە هۆی تێکەڵی



لەگەڵ سێ دەسەڵاتە دەوڵەتییەکەدا، پێڕەوی پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی دەستوورنو دەبێ بڕیارەکانی بەکار بێنن. هەموویان لەژێر چاوەدێریو کۆنترۆلی هێزو نیهادەکانی یەکتر دان. بەم جۆرە دەسەڵاتی دەوڵەتی لە دیموکراسییە مۆدێرنەکاندا، بەهۆی سیستەمێکی ئاڵۆز کە لەسەر کۆسپو کێشی بەرامبەر دامەزراوە، سنووردار کراوە. پارێزەری ئەم سیستەمە ئاڵۆزە، دیارە نەریتی حاکمیەتی قانوون وەك یەکێکی دیکە لە پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی دیموکراسییە مۆدێرنەکانە.

## حکوومەتی قانوون

دیموکراسیو حکوومەتی قانوون پێوەندییەکی نەپچڕاویان هەیە. لەژێر چەمکی حاکمیەتی قانووندا، تەواوی بنەماو شێوە رەفتارەکان وای لێ تێدەگەیشترێ کە ئازادیی تاك و بەشداریی وی لە ژیانی سیاسیدا دابین دەکا. حکوومەتی قانوون هێزی بەرامبەری حکوومەتی سەرەڕۆو پۆلیسییە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی حکوومەتە سەرەڕۆیەکان، قانوونشکێنیو خۆدزینەوە لە قانوونە. لەم جۆرە حکوومەتانەدا تاك بەشێوەی بەردەوام لەسەرەوەڕا لەژێر چاوەدێریو مەترسیی دەستدرێژیی ئۆرگانە ئەمنیەتییەکان دایە. ئەو هەمیشە ئەو هەستەی هەیە کە دەوڵەت وەك مۆرەیەکی جێی شكوگومان سەیری دەکا. بەم جۆرە لەم جۆرە سیستەمانەدا، کەشوهەوای پێکەوە ژیانی مرۆڤەکان ژەهراوییە. هاوولاتان سەرەڕای ئیحتیاتی پێویست، لە تەعقیبی دەوڵەت ئەمین نین. ئەوان بە دووکەسایەتی(دوشخصیتی) رادێنو ناچارن لە بەرچاوی خەڵك دەست بکەن بە رواڵەتسازیو خۆ سانسۆر کردن. لە سیستەمێکی دیموکراتیك دا کە قانوون زاڵە، ئۆتۆریتەی دەوڵەت پێوەندیی بە وەبەرچاوگرتنی دەستوورەوە هەیەو هەربۆیە دەوڵەتە پێشکەوتوە دیموکراتیکەکان دەوڵەتی دەستووریشیان پێ دەگوترێ.

لە دەوڵەتی قانوونگەرادا دەزگا قەزاییەکان سەربەخۆیی تەواویان هەیە. ئەم مەسەلەیە گرنگییەکی تایبەتیی هەیە. دەسەڵاتەکانی بەڕێوەبردنو قانووندانان مافی دەستێوەردان لە بڕیارەکانی دادگایاندا نیە. هەربۆیەش تەنیا ئەو کاتە دەکرێ قسە لە

سەربەخۆیی دەزگای قەزایی بکرێ کە بڕیاردان لە کاری قەزاوەتدا، لە پاوانی قازییە سەربەخۆیەکان دابێ. کەوابوو دەتوانین بڵێین دابەشکردنی دەسەڵاتو حاکمیەتی قانوون، پێوەندییەکی نەپچڕاویان هەیە.

بەڵام دەبێ ئەوەش زیاد بکەین کە بە بوونی بڕیاری سەربەخۆیانەی قازی، تەنیا لایەنێکی دەوڵەتی قانوون وەسف کراوە، لایەکەی دیکەی ئیعتیباری ئەم پرەنسیپەیە. ئەم حکوومەتە تەنیا لە جێگەیەك دەتوانێ بەرقەرار بێ کە هاووڵاتان بەوردی بزانن مافی چ کردەوەگەلێکیان هەیەو بۆخۆیان مافی چ کارێکیان هەیە یان نیە. کەوابوو بنەمای حکوومەتی قانوون لەسەر ئەم بناخەیە دامەزراوە کە بەبێ پاڵپشتی قانوون ئیزنی سزادانی هیچ تاکێکی نیە. مادەی ناروونو درێژ کە تەعبیری جۆراوجۆری لێ بکرێ ئەمنیەتی قانوونی لاواز دەکاو حکوومەتی قانوون بەرەو سەرەولێژیی نەمان پاڵ پێوە دەنێ. هەربۆیە پرەنسیپی روونبوونی قانوون بە مەبەستی هەڵسەنگاندنو لەبەرچاو بوونی کردەوەی دەوڵەت، لە پێش مەرجە بنەڕەتییەکانی حکوومەتی قانوونە. هەر کردەویەکی دەوڵەت دەبێ لەسەر بنەمای قانوون بێ، ئەو قانوونەی کە بۆخۆی خاوەنی هەقانیەتی دیموکراتیکە.

حکوومەتی قانوون لە خزمەتی دیموکراسیدا کۆمەڵێك بڕیارو رەفتارو رێوشوێن چاودێریی دیاری دەکا تاکوو شکڵوشێوەیەکی روون بداتە نیهادە گشتییەکانی کۆمەڵگە. حکوومەتی قانوون دەسەڵاتو سیاسەت بەهۆی هەودای قانوونو ماف کۆنترۆڵ دەکا تاکوو لەژێر سێبەری ئەمەدا ئازادیی هاووڵاتانی دەستەبەر بکا. حکوومەتی قانوون زۆرەملیی بۆ پێرەو کردنی خەڵك نیە، بەڵکوو پشت ئەستوور بە هاوکاریی خۆبەخشانەی مرۆڤە قانوون گەراکانە. حکوومەتی قانوون ئەوە دەسەلمێنێ کە دیموکراسی لەسەر باوەڕی هاوبەشو تەوافوقی دەروونیی هەموو هاووڵاتان بە مەبەستی وەبەرچاو گرتنو پاراستنی مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دامەزراوەو تەنیا لەسەر ئەم بنەمایەیە دەوامو مانەوەی دەستەبەر دەکرێ.



## فەرهەنگیی سیاسیی دیموکراتیك

لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان بە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی سیستەمی دیموکراتیك کردو سەرکیترین خاڵەکانیمان نیشان دا. روونمان کردەوە کە دیموکراسی شێوەیەکی ئاڵۆزو دژوار لە دەوڵەت، رێوشوێنی بەڕێوەبردنی وڵاتو شێوەی حکوومەتە. لە راستیدا ئەگەرچی ئامانجی دیموکراسی وەك وەدیهێنانی زیاترین رادەی ئازادی، مافی بەشداریو دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، روونو ئاشکرایە، بەڵام گەیشتن بەو ئامانجە، یەکجار زۆر ئاستەمەو پێویستیی بە رێوشوێنی هەڵسوکەوتی ئاڵۆزو ناسك هەیە.

دیتمان کە ئازادیی تاكو ئیمکانی گەشەکردنی کەسایەتیی وی، لە رەوتی کامڵبوونی سیاسیی کۆمەڵگەدا، لە زۆر لایەنەوە لە مەترسیی جیددی دایە، و توخمە پێکهێنەرەکانی دیموکراسی لەراستیدا رێگە چارەی جۆراوجۆرن کە دەبێ لەبەرامبەر ئەم جۆرە مەترسیانەدا راوەستن. بەواتایەکی دیکە دەبێ بڵێین کە رێگەچارە جۆراوجۆرەکان بۆ پاراستنی سیستەمی دیموکراتیك، ئاکامی وەسەریەك کەوتنی ئەزموونە مێژوویییەکانە. ئەم ئەزموونانە، نەك هەر ئاڵۆزیی پێگەیشتنو کامڵبوونی رەوتی دیموکراتیزە بوونی کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی دەردەخەن، بەڵکوو تواناو خۆڕاگریی سیستەمی دیموکراتیك لە زاڵبوون بەسەر گیروگرفتەکانیشدا زیاد دەکەن.

هەست کردن بە پێوەندیی نێوان ئەم ئاڵۆزیو ناسکییە، بەو مانایەیە کە بۆ گەیشتن بە راستییە سیاسییەکان نوسخەیەکی سادەو مەنتیقیی نیە، چونکە راستییە سیاسییەکانی کۆمەڵگەیەك بۆخۆیان سادەو مەنتیقی نین. بەڵکوو زۆر ئاڵۆزنو نوسخەی سادە هەڵ-ناگرێ. ئەوە مرۆڤەکانن راستییە سیاسییەکان دەخولقێنن. بەڵام هەڵسوکەوتی مرۆڤ بە ئاسانی نابینرێو موحاسەبە ناکرێو ناکرێ لە فۆرمۆلی سادەدا کورت بکرێنەوە.

کەوابوو بەناچار دەبێ پەی بە ئاڵۆزیی دیموکراسیی مۆدێڕن، لایەنە جۆراجۆرەکانیو دەوڵەمەندیی کێشە دەروونییەکانیشی بەرینو خۆ بپارێزین لە روانینی یەکلایەنەو موتلەق گەرایی توخمە جۆراوجۆرە پێکهێنەرەکانی. ناتوانین دیموکراسی تا ئاستی فۆرمۆلی

سادەی وەك " حاكمیەتی راستەوخۆی خەڵك"، " بەشداریی سیاسی"و...هتد بێنینە خوارێ. خشتە پێكهێنەرەكانی بینای دیموكراسی، هەرچەند هەر كامیان لە جێی خۆیاندا پێویستو بەنرخن، بەڵام هیچ كامیان بە تەنیا ئەم بینایە دروست ناكەن.

دیموكراسی جگە لەوەی كە سیستەمێكی ئاڵۆزی سیاسییە، سیستەمێكی ئەوتۆیە كە بەردەوام پێویستیی بە ریفۆرمە. مێژووی دیموكراس هەرلەو كاتەش دا مێژووی رێفۆرمەكانیەتی. تەنیا ئەو سیستەمە دیموكراتیكە داهاتووی هەیە كە هەمیشە تایبەتمەندیی قبووڵكردنی رێفۆرم لە خۆی دا بپارێزێ. هەر لەم كاتەشدا دەبێ ئەوەمان لەبیر بێ كە ئیسلاحی سیستەمی دیموكراتیك تەنیا بە شێوەی دیموكراسی دەكرێ.

لەلایەكی دیكەوە سەبارەت بەوە كە دیموكراسی بەرهەمی مرۆڤە دیموكراتەكانە، تەنیا ئەو كاتە وەدی دێ كە پێگەیەكی بەربڵاوی لە نێو خەڵكدا هەبێ. بۆیە كاریگەریی واقعیی دیموكراسی پێویستیی بە فەرهەنگێكی سیاسیی دیموكراتیك هەیە. فەرهەنگی سیاسیی كۆمەڵگەیەك بەواتای هەموو ئەو ناسینانە، بیرو باوەڕو بایەخەكانی خەڵكی ئەم كۆمەڵگەیەیە لە پێوەندی لەگەڵ  سیستەمە سیاسییەكەیدا. بەم پێیە ئاشكرایە كە سیستەمی دیموكراتیك ناسینو رێبازی دیاریكراوی لە هاووڵاتانی خۆی دەوێ. ساویلكانەیە ئەگەر پێمان وابێ دەتوانین دیموكراسییە مۆدێرنەكانی كۆمەڵگە پێشكەوتووەكان بە ئاسانی لەو كۆمەڵگایانەدا پیادە بكەین كە خاوەنی سوننەتی پتەوی دیموكراسی نین. دیموكراسی پێویستیی بە هاووڵاتانێكە كە رێوشوێنەكەی بزانن، قبووڵی بكەنو وەبەرچاوی بگرن. دیموكراسیی مۆدێرن منداڵی سەردەمی رۆشنگەرییەو بەستراوە بە رۆشنگەرییە. كەوابوو دیمكراسی بەر لە هەر شتێك پێویستیی بە فێركردنی سیاسی هەیە.

بەڵام فەرهەنگێكی دیموكراتیكو پێشكەوتووی سیاسی، مەرجگەلی پێشوەختی هەورازتر لە ئاگایی رووتی هاووڵاتان لەسەر رێوشوێنی رەوتی دیموكراتیك هەیە. فەرهەنگێكی ئەوتۆ پێویستیی بە نیهادینە بوونی بیری دیموكراتیك لە هەموو بوارەكانی كۆمەڵایەتی دایە. دەوڵەتی دیموكراتیك تەنیا ئەو كاتە دەتوانێ چاوەڕوانیی داهێنانو وەرگرتنی بەرپرسایەتیی لە هاووڵاتانی خۆی هەبێ كە لە ئاستی



جۆراوجۆردا لە ماڵێ را بگرە تا قوتابخانەو شوێنی كار، دەرفەتی ئەزموونو تاقیكاریی كەسایەتیان بەبێ رێنوێنیی سەرەوە هەبێ. كەوابوو دیموكراسی تەنیا ئەوكاتە گاریگەریی واقعیی دەبێ كە كەشوهەوایەكی لەبار بۆ بەهێزكردنی باشییەكانی دیموكراسیو بەكارهێنانیان پێك بێنێ. كەوابوو دەوڵەتی دیموكراتیك هەمیشە پێویستیی بە كۆمەڵگەیەكی دیموكراتیك هەیە.

فەرهەنگی سیاسیی دیموكراتیك مانایەكی دیكەشی هەیەو ئەویش بریتییە لە كەشوهەوایەكی كراوە لە كۆمەڵگەدا بەمەبەستی شانسی بەرابەر لە نێو هاووڵاتاندا. رەگەز، بەستراوەیی قەومیو نەژادی، بیروباوەڕی ئایینیو ئایدیۆلۆجیو بەستراوەیی چینایەتی نابێ ببنە پێوانە بۆ ئیمكانی گەشە كردنی تاك لە كۆمەڵگەیەكی دیموكراتیكدا، بەڵكوو تەنیا تواناو لێوەشاوەیی تاكە كە ئەم پێوانەیە دیاری دەكا.

فەرهەنگی سیاسی لە كۆمەڵگەیەكی دیموكراتیكدا، چاوەڕوانیی لە هاووڵاتانی خۆی هەیە بایەخە دیاریكراوەكان وەبەرچاو بگرێو هێندێك شێوەی هەڵسەكەوتی تایبەتی قبووڵ بكا. لێبووردەییو وەبەرچاو گرتنی ئینساف لە پێوەندی لەگەڵ كەسانی دیكەدا، نموونەیەكن لەو بایەخو شێوە هەڵسوكەوتانە. فەرهەنگی سیاسیی دیموكراتیك شێوەیەكی ئەتۆ لە هاموشۆ پەرە پێ دەدا كە دەرفەتی كردەوەی سەربەخۆ كەلەگەڵ ئیرادەی ئازادو عەلاقەی تاك دا بگونجێ، پێك دێنێ. فەرهەنگێكی ئەوتۆ مرۆڤەكان بۆ چاوكراوەییو بەڵگەی عەقڵی بۆ رازی كردنی خەڵكی دیكە بانگهێشتن دەكا. نەك ئەوە كە چاوەڕوانیی لەوان بێ پێڕەوییەكی كوێرانە بكەنو لەشاری كوێراندا دەست بە چاویانەوە بگرن. سوور بوون لەسەر عەقلانیەتو ئاسانگیری لە بەرامبەر عەلاقەو بیرو باوەڕەكانو شێوە جۆراوجۆرەكانی ژیاندا، رەوتی فەرهەنگی سیاسیی دیموكرات پێك دێنن. لە فەرهەنگێكی سیاسیی دیموكراتدا هیچ كەس ترسی لە بیری جیاو جیاوازبوون لەگەڵ خەڵكی دیكە نیە.

بەڵام ئەوە خراپ تێگەیشتنە ئەگەر پێمان وابێ فەرهەنگی سیاسیی دیموكراتیك هەموولایەك بۆ خۆشەویستیو دلۆڤانی بە نیسبەت هاونەوعەكانی بانگهێشتن دەكا. خەیاڵێكی ئەوتۆ لەگەڵ راستییە دژوارە كۆمەڵایەتییەكاندا ناگونجێ. دەبێ جارێكی دیكە

پێ لەسەر ئەوە دابگرینەوە کە دیموکراسی وەك شێوەیەکی تایبەت بۆ پێکەوە ژیانی مرۆڤەکان مانایەکی دیکەی جگە لە کێشەو مناقشە نیە، کەوابوو کەشوهەوای دیموکراسی قەت ناتوانێ کەشوهەوایەکی بە دوور لە کێشە و ژیانێکی جیهانیی رێکوپێكو بێ سەرئێشە بێ. بەڵام ئەوەی دیموکراسی لە سیستەمەکانی دیکە جیا دەکاتەوە چۆنیەتیی چارەسەری ناکۆکییەکانو شێوەی چارەسەری کێشەکان لەو سیستەمە دایە. لە فەرهەنگێکی سیاسیی دیموکراتیکدا کێشەو دژایەتییەکان شتێکی سروشتینو بۆخۆی وەك هۆیەك بۆ گەشەکردنو پێشکەوتن سەیری دەکرێ نەك بیانوویەك بۆ درەکردن وەلانان. کەوابوو ئەگەر بێتو ئازادیو دیموکراسی وەدی بێن، کۆمەڵگەی کراوە، لە پەنا بیروباوەڕەکاندا، عەلاقەو رووحیە جیاوازو دژبەیەکەکان کە پێکەوە لە کێشە دان، بۆ ئەم کێشانە پێویستیی بە فەرهەنگی دیموکراتیکە. بە جورئەتەوە دەتوانین بڵێین کە دیموکراسی تەنیا لەسەر بنەمای فەرهەنگێکی ئەتۆ دا دەتوانێ راوەستاو بێ.

خراپ نیە ئەم وتارە بە وتەیەکی جۆرج نیبۆر Niebuhr Georg لێکۆڵەرو مێژووزانی ئەڵمانی لەبارەی دیموکراسییەوە کۆتایی پێ بێنین: " ئامادەیی مرۆڤ بۆ بەرقەراریی عەداڵەت، ئیمکان بۆ دیموکراسی پێك دێنێو، مەیلی مرۆڤ بۆ بێعەداڵەتی، دەبێتە هۆی پێویست بوونی دیموکراسی".



## ئالێکسی دوتوکوڤیل

## ( ١٨٠٥ ــــ ١٨٥٩ )

### یەکەم بیرمەندی مۆدێرنیتە کە دڵەڕاوکێ سەرەکییەکەی بریتی بوو لە "ئازادی"و "ئەنجومەنی شار"

**ن: موحسینی حەیدەریان**

### پێشڕەوانی مۆدێرنیتە

مۆدێرنیتە، نوێخوازی یان مۆدێرنیزم هەم چەمکێکی فکریو فەرهەنگییەو هەم روانگەو هەروەها راستییەکی مێژوویيو کۆمەڵایەتییە. مۆدێرنیزم وەك روانگەیەکی فکریو فەرهەنگی، بەرهەمی چەند سەدەی هەوڵو نوێخوازیی بژاردەو بیرمەندانێکی زۆر بوو. لەسەردەمی رێنسانسەوە لە سەدەی پازدە دەست پێ دەکا. بەبەرهەمەکانی کەسانی وەك شێکسپیرو ماکیاڤیلی دەستی پێکرد. پاشان لە قۆناغەکانی رۆشنگەریو واقیعگەرایی یان هاتنە گۆڕی عەقلانیەت، مافی سروشتیو یەکسانیی هاووڵاتانو ... هتد دا پێگەیشتو بەهێز بوو. بەواتایەکی دی زەمینەکانی مۆدێرنیتە بریتی بوون لە رەوتێك لە قۆناغی رێنسانسدا بە هۆی سەرهەڵدانی بیری مرۆڤایەتیو روانگەی نوێ بۆ ئایینو سیاسەتو ئەخلاق، تۆوەکەی داچێندرابوو. پاشان لە ناخی ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییەکانو هەڵدانی سەرمایەداری، داهێنانە نوێیەکان، بە تایبەتی پەرەگرتنی بیری رۆشنگەرانەی سەدەی هەژدەدا سەری وەدەرنابوو.

کێشە فەلسەفیو فکرییەکان لە سەرانسەری سەدەی نۆزدەدا لەسەر تەوەرەی ئازادی، دێموکراسیو تاکخوازی ( فەردگەرایی ) دەرفەتێکی لەباری بۆ سەرهەڵدانی مۆدێرنیزم لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا هەم وەك روانگەیەكو هەم وەك راستییەکی کۆمەڵایەتی ڕەخساند. زەقبوونەوەی چەمکی تاكو تاکخوازیو تێڕوانینی نوێ لەبارەی مرۆڤ و جیهاندا کە زۆری پێنەچوو شۆرشێکی گەورە لە فیزیکداو دەرکەوتنی ئەنشتەینی لەگەڵ کەوت، نیشانەی بەرەوپێش چوونی بایەخە نوێیەکان لە دنیای ئەندێشەو ئەدەبو هونەر دابوو. ئەمە چ لەرووی مێژوویيو چ لەرووی روانگەی کۆمەڵایەتیو سیاسیو فەرهەنگییەوە ناوی جۆراوجۆری وەك، مۆدێرنیتە، بزووتنەوەی مۆدێرنیزم یان سەردەمی مۆدێڕنی بۆدانراوە.

یەکێك لە کاریگەرترینو بەناوبانگترین کەسایەتییە بیرمەندەکانی مۆدێڕنیتە ناوی ئالێکسی دو توکوڤیلە کە رۆڵێکی بەرچاوی لەرەوتی پرسیار خولّقاندن، رەخنەو بیرکردنەوەدا هەبوو. ئەو لەگەڵ دوو بیرمەندی بەناوبانگی دیکەی سەدەی نۆزدە کارل مارکسو جۆن ستوارت میل لەیەك سەردەم دا دەژیا. بەڵام وێکچوونێکی زۆر لەبواری ئەوەدا کە دڵەراوکێی هەردووکیان ئازادیو دێموکراسی بوو لە نێوان جۆن ستوارت میلو توکوڤیل دا دەبینرێ. سەیر ئەوەیە سەرەڕای ئەوەی مەسەلەی ئازادی لە روانگەی ئەو دوو بیرمەندەوە لە دوو بارودۆخی تەواو جیاوازو لە دوو سیستەمی جیا، واتە بریتانیاو ئەمریکا هەڵسەنگێندراوە، هەردووکیان لەو ئاکامە بنەڕەتییەدا هاودەنگن کە پێوەندییەکی ئاشکرا لە نێوان دیموکراسیو بەشداریی سیاسی، ئۆتۆنۆمی و گەشە کردنی کەسایەتیی مرۆڤەکاندا هەیە.

## ژیاننامەیەکی کورتی توکوڤیل

ئالێکسی دو توکوڤیل لە بنەماڵەیەکی ئەریستوکراتیی تۆرماندی لە فەرانسە لە دایك بوو. باوکی کاربەدەستێکی پایەبەرزی حکوومەتی پاشایەتیی ئەو کاتی فەرانسە بوو. ئەو پێوەندیی بە بەرزترین توێژی خاوەن سامانی حکوومەتی فەرانسەوە هەبوو. زۆری نەمابوو لە شۆرشی فەرانسەدا سەری وەبەرگیوتینی شۆرشگێران بکەوێ. بەڵام پاش رووخانی ناپلیۆنو بووژانەوەی حکوومەتی پاشایەتیی فەرانسە، باوکی توکوڤیل دیسان رزقو نسیبەکەی جاران رووی تێکردەوەو چالاکانە لە بنیات نانەوەی دەزگای پاشایەتی دابەشدار بوو.



تێڕوانینی سیاسیی ئالێکس دو توکوڤیل لەسەردەمی لاوەتی نارێكو پچڕپچڕ بوو. ئەو لەلایەك لەگەڵ بیروباوەڕی کۆنی بنەماڵەکەی لایەنگری سیستەمی پاشایەتی بوو. بەڵام وێڕای ئەمە لاوازییە گەورەکانی ناخی پاشایەتیو ئەریستۆکراسیی فەرانسەی لەبەر چاو بووو رەخنەی توندی لێدەگرت. ئەم دوو چەشنەییە، دوتوکوڤیلی لاوی تووشی ئاڵۆزیی دەروونی کردبوو. توکوڤیل لە ساڵەکانی ١٨٣١و ١٨٣٢دا بەمەبەستی یەکەمی موتاڵای سیستەمی جەزایی ئەمریکا بوو. بەڵام قۆناغی مانەوەو خوێندنەوەی بەربڵاوی وی لە ئەمریکادا زەینی تینووی توکوڤیلی بەرەوپانتاییەکی بەربڵاوتر پەلکێش کرد. توکوڤیل لەماوەی ئەو چەند ساڵەی لە ئەمریکا بوو، لەرێی بەراوردکردنی هەلومەرجی ئورووپا کە تووشی ناسەقامگیریو دڵەراوکێی سیاسیو قۆناغی پەڕینەوە ببوو لەگەڵ ئەمریکایەك کە قۆناغی گەشەکردنو ئاوەدانیی خۆی تێپەڕدەکرد، چاوە وردبینو تیژەکانی خۆی بەسەر دۆزینەوەی قانوونە نەنووسراوە سیاسییە گرنگەکان دا هەڵێنا.

دۆزینەوەی تایبەتمەندییە بێوێنەکانی سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتیی ئەمریکا شتێك بوو لە کتێبە بەناوبانگەکەی توکوڤیل دا بە ناوی" دێموکراسی لە ئەمریکا de la democratic en ameriaue" بەری گرت. ئەم کتێبە لەدوو بەرگی جیادا لە ساڵەکانی ١٨٣٥و١٨٤٠دا بڵاو کرایەوە. ئەم کتێبە لەبەرهەمە گرنگو کلاسیکییەکانی ئەندێشەی سیاسی دەژمێردرێ.

پێویستە بزانین ئۆگریی توکوڤیل بە سیاسەت لە پێشدا لایەنی تیئۆریو فکریی هەبوو. بەڵام پاشان بەکردەوە کێشرایە نێو مەیدانی سیاسییشەوە. چەندین جار وەك نوێنەری هەڵبژێردراوی شووراکانی شارو هەروەها پارلمانی فەرانسە بەشدار بوو. پاش شۆرشی فێبریوەری ١٨٤٨ یەکێك لە ئەندامە کاریگەرو دیارەکانی ئەم وڵاتە بوو. توکوڤیل ماوەیەکی کورتیش پۆستی وەزارەتی دەرەوەی فەرانسەی پێ سپێردرا. بەڵام پاش کودیتای لویی ناپیلیۆن بوناپارت قۆناغی بەرپرسایەتیە سیاسییەکانی کۆتایی پێهات، چونکە پشتیوانیی لەم کودیتایە نەکرد.

توکوڤیل لە دوایین ساڵەکانی ژیانیدا دیسان لە روانگەیەکی فکرییەوە رووی دە سیاسەت کردەوەو بەئۆگرییەوە خەریکی تەواوکردنو نووسینەوەی بەرهەمە تیئۆرییەکانی خۆی بوو. توکوڤیل بەر لەمردنی توانی یەکەم بەشی کتێبە گەورەکەی لەبارەی شۆرشی فەرانسەدا تەواو بکا. ئەم کتێبە لەساڵی١٨٥٦دا واتە سێ ساڵ پێش مردنی توکوڤیل بڵاو بۆوە. لەم کتێبەدا زەمینەی ئایدیۆلۆژیو کۆمەڵایەتییەکانی شۆرشی فەرانسەی بەقووڵی شی کردەوە. هەرچەند کتێبی "دێموکراسیی ئەمریکا"و کتێبەکەی دیکەی" لەبارەی شۆرشی فەرانسەدا"زیاتر لە بیست ساڵیان کەوتە نێوان، بەڵام دووره دیمەنی هەر دوو کتێبەکە یەکە: پێوەندیی نێوان ئازادیو یەکسانیی کۆمەڵایەتی.

توکوڤیل لە هەردوو ئەو بەرهەمە گرنگانەی خۆیدا کەڵکی لە شێوەی کۆمەڵناسانەو هەڵسەنگاندنی مێژوویی وەرگرت، نەك لە شێوەی فەلسەفی. توکوڤیل لەو بەرهەمانەدا بەروونی نیهادە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان شی دەکاتەوەو بە هێنانەوەی نموونەی دیاریکراو دەیەوێ نیشان بدا ناکۆکیی بایەخو ئامانجەکان چۆن لە هەڵسوکەوتی نیهادە سیاسییەکاندا دەردەکەون. شێوەی بەڵگەهێنانەوەی توکوڤیل شیکاریو بەکارهێنانی نموونە مێژووییەکانە. بەڵام لە هەموو شیکردنەوەو نموونە هێنانەوە مێژووییەکانیدا بیرمەندێك بەدی دەکەی بە لە مەترسی کەوتنی ئازادییەکانو ئیمکاناتی گشتیی کۆمەڵ لە ترسو نیگەرانیدا دەژی. ماکەی ئەندێشەی توکوڤیل ئەوەیە هەر شتێك لە کۆمەڵگەی مۆدێڕندا بە تازەیی لە کۆسپو تەگەرەی ئەریستۆکراسی پەڕیوەتەوە، دەکرێ ببێتە هۆی لە مەترسی هاویشتنی ئازادیو ناسکتر لە ئازادی بەدی ناکرێ. دڵەراوکێی سەرەکیی توکوڤیل ئەوەیە رێوشوێنێك وەدۆزێ مەترسیی زەرەر گەیاندن بە ئازادیی تاك بگەیەنێتە لانی کەمی خۆی. توکوڤیل لە کتێبی" شۆرشی فەرانسە"دا باسی رووبەرووبوونەوەی" کۆمەڵگەیەکی خەیاڵی" لەگەڵ" کۆمەڵگەیەکی واقعی" دەکاو دەی سەلمێنێ چۆن کۆمەڵگەیەکی خەیاڵیی ئەهلی فکر وئەدەب توانی بەسەر کۆمەڵگەیەکی واقعیدا سەرکەوێ. ئەم "کۆمەڵگە خەیاڵی"یە کە لە بیروزەینو ئامانجی رووناکبیرانی شۆرشگێڕی فەرانسەدا هەبوو، بەگوێرەی تێزی سەرەکیی توکوڤیل رۆڵکیی چارەنووسسازی لە شۆرشی



فەرانسەدا هەبووو توانی بەکردەوە ئاڵوگۆڕ بەسەر پێوەندی کۆمەڵایەتییەکانی فەرانسە دابێنێ. کتێبەکانی توکوڤیل هەردووکیان گرنگییەکی زۆریان هەبووو بوون بە سەرچاوەیەکی گرنگوکلاسیکیی ئەدەبیاتی سیاسیی جیهان. زۆر کەس لە خاوەن ڕایان کتێبی "شۆرشی فەرانسە"ی توکوڤیل وەك شۆرشێك لەمێژوونووسینی فەرانسە سەیر دەکەن. ئەو توانی باڵادەستیی روانگەی سوسیالیستیو هەروەها روانگەی کۆمەڵناسانەی مارکسیستی بخاتە ژێر پرسیارەوە. بەڵام کتێبەکەی دیکەی توکوڤیل واتە "دێموکراسی لە ئەمریکا"ش سەرچاوەیەکی گرنگی ئەندێشەی سیاسیو یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی ئەندێشەی دێموکراسییە. لێرەدا تەنیا ئەم بەرهەمە هەڵدەسەنگێندرێ.

## یەکسانی، ئازادیو کۆیلەتی: کێشەی سەرەکیی سەردەمی مۆدێڕنیتە

پێویستە بزانین ئەو بابەتەی توکوڤیل سەرنجی پێدەدان لە گرنگترین مەسەلە بنەڕەتییەکانی مۆدێڕنیتەن. ئەمە قۆناغێکە پێشکەوتنی پیشەسازیی هەلومەرجی سەرهەڵدانی نایەکسانیی رۆژ لە رۆژ زیاتر پێك دێناو دەبووە هۆی زیادبوونی چینە هەژارەکان. هەروەها پێشکەوتنی پیشەسازی ببووە هۆی کەلەبەری نێوان دوو دروشمی شۆرشی فەرانسە واتە ئازادیو بەرابەری. هەلومەرجێکی ئەوتۆ مەسەلەی هەڵبژاردن لەنێوان ئازادیو یەکسانیی کردبوو بە سەرەکیترین مەسەلە. توکوڤیل دەیدیت ژیانی مۆدێرنیتە بەشێوەیەکی نوێ بە سیستەمی ژیانی ئابوورییەوە بەستراوەتەوە، کەوابوو دەینووسی گەشەکردنی تایبەتیو دەروونیی ئەم سیستەمە ئازادی دەخاتە مەترسییەوە. ئەم خاڵە گرنگە هەر هەمان مەسەلە بنەڕەتیەکەیە کە بوو بە هۆی دوورکەوتنەوەی لیبرالیزم.

توکوڤیل لەیەکەم رستەی کتێبی"دێموکراسی لە ئەمریکا" دا دەنووسێ: "لە نێو ئەو هەنگاوانەی دەوڵەتی ئەمریکا هەڵی گرتوون هەوڵدان بۆ پێکهێنانی یەکسانی لە بارودۆخی ژیانی هاووڵاتاندا زەقترین شت بوو و زیاتر لە هەر شتێکی دیکە سەرنجی منی بۆ لای خۆی راکێشاوە." توکوڤیل پاشان دەڵێ هەوڵدان لەرێگەی یەکسانیی هاووڵاتان لە

ولاتانی قارەی ئورووپاشدا وەبەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەم هەولانە لە ئەمریکادا هەنگاوی زیاتری ناوە. بەم پێشەکییە توکەڤیل ئەم پرسیارە دێنێتە گۆڕێ:" کۆمەڵگەی ئەمریکا دەتوانێ چ شیکردنەوەیەکی لەبارەی ئاکامی سیاسیی زۆربوونی یەکسانیدا هەبێ؟" ئەم پرسیارە ئەوە دەگەیەنێ کە شیکردنەوەی توکوڤیل لەبارەی کۆمەڵگەی ئەمریکادا رووی لە هەڵسەنگاندنێکی گشتییە. ئەو بەدوای وەڵام بۆ پرسیارەکان لە بارەی دیموکراسیو ئاکامەکانی، ئاکامە باشەکانیو هەروەها کەموکوڕییەکانیدا دەگەڕێ.

لە هەوڵدان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا توکوڤیل دەست دەکا بە کێشانەوەی وێنەیەك لە کۆمەڵگای ئەمریکا لەروانگەی یەکسانیی گشتیەوە. بەگوێرەی شیکردنەوەکانی توکوڤیل هەرچەند یەکسانی بەتەواوی لەئەمریکادا وەدی نەهاتوە، بەڵام چۆتە ناخی هەموو بەشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەم ولاتەو خەریکە جێی خۆی دەکاتەوە. ئەم هەلومەرجە لەپێشدا ئاکامی هەوڵدان لە رێگەی یەکسانیی مادی بە مانای لابردنی فەرقوجیاوازیی کۆنە کە بە ئاشکرا لە کۆمەڵگەی ئەمریکادا دیارە. ئەم هەولانە زیاتر لە هەر شتێك لە ئاکامی قانوونی میرات لەم ولاتەدایە. بەگۆێرەی ئەم قانوونە هەموو منداڵان لە هەر بنەماڵەیەکدابن، بێ سەرنجدان بە رەگەز یان هۆیەکی دیکە لە وەرگرتنی میراتدا یەکسانو بەرابەرن, ئەم قانوونە دەبێتە هۆی ئەوەی ملکدارییە گەورەکان هەڵبوەشێنەوەو دابەش بنو تواناو دەسەڵاتیان نەمێنێ. پاشان یەکسانیی فکری لە ئەمریکا دا زیاتر لە هەر شوێنێکی دیکە جیهاندا پێكهاتوە. شیکردنەوەکانی توکوڤیل ئەوە دەگەیەنن کە مەبەستی وی ژمارەی خوێندەواران لە چاو سەرجەم حەشیمەتی ولاتە کە بەرزترین ژمارە لە جیهان دایە. توکوڤیل درێژە دەدا: " هەموو کەس لە کۆمەڵگەی ئەمریکادا دەستی بە پەروەدەی گشتی رادەگا. بەڵام سەبارەت بەوەی پەروەردەی پسپۆڕی بۆ دۆزینەوەی کار گرنگە، زۆر کەس وای پێباشترە لە جیاتی پەروەردەی گشتی کاتی خۆیان بۆ پەروەردەی پسپۆڕی تەرخان بکەن. ئەم هەلومەرجە بۆخۆی جۆرێك یەکسانیی پەروەدەییو فکریی پێك هێناوە."



بەرلەوەی لەسەر روانگەکانی توکوڤیل بڕۆین پێویستە ئاماژەیەك بە شیکردنەوەی وی لە بارەی دیموکراسیدا بکەین. چونکە چەمكو واتای دیموکراسی بۆ تێگەیشتن لە بۆچوونو باسەکانی وی دا گرنگییەکی تایبەتیی هەیە. توکوڤیل دێموکراسی بەدوو مانا بەکار دێنێ. لەمانای یەکەمدا مەبەستی توکوڤیل لە دیموکراسی هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتییە نەك شێوەیەك لە حکوومەت. ئەو دیموکراسی لە دژی ئەریستۆکراسیو رێژیمی پێشوو کە لە سەر نایەکسانی دامەزرابوو بەکار دێنێ. ئەو پێلەسەر ئەوە دادەگرێ بە لەنێوچوونی رێژیمی ئەریستۆکراسی لە ئەمریکادا دەرفەتی یەکسان بۆ ئەفرادو چینە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان پێك هاتوە. بەڵام لە مانای دووەمدا مەبەستی توکوڤیل لە دێموکراسی بریتییە لە "سیستەمی بڕیاردانی سیاسی لەسەر بنەمای هەڵبژاردنی زۆرایەتیی کۆمەڵگەو مافی بنەڕەتیو گشتی"و بە تایبەتی سەروەریی گەل. کەوابوو جیاکردنەوەی ئەو دوو چەمکەی سەرەوە بۆ تێگەیشتن لە ئەندێشەی توکوڤیل گرنگییەکی زۆری هەیە. چونکە لەروانگەی توکوڤیلەوە دیموکراسی لە مانای یەکەمو گشتیی خۆیدا وا نیە کە حەتمەن دێموکراسی بەمانای دووەمو تایبەتی خۆی بەدواوەبێ. توکوڤیل لەسەر ئەو باوەڕەیە وا نیە بە لە نێوچوونی رێژیمی ئەریستوکراسی یان وەدیهاتنی یەکسانیی کۆمەڵایەتی بە شێوەی رێژەیی، هەمیشە رێگە بۆ دابین بوونی سەروەریی گەل کراوەبێ.

توکوڤیل پاشان باسی لایەنێکی دیکەی یەکسانی لە کۆمەڵگەی ئەمریکادا دەکا کە دابەشبوونی دەسەڵاتە. توکوڤیل وێڕای ئاماژە کردن بە یەکسانیی مادیو فکریی سەرەوە بەو ئاکامە دەگا کە رێگەخۆش کردنێکی ئەوتۆ دەبێتە هۆی یەکسانیی زیاتری خەڵك لە بەرامبەر دەسەڵاتدا. توکوڤیل پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ:"لە ئەمریکادا هیچ بنەماڵەیەكو گرووپێکی تایبەتی خاوەنی دەسەڵاتێکی تایبەتیو لە رادەبەدەری نیە. تەنانەت زۆر جار کەسێکی نائاسایی نابینی خاوەنی دەسەڵاتو دەسترۆیشتوویەکی بەردەوام بێ." پێویستە بگوترێ سیستەمی قەزایی سەربەخۆو عادڵانەی ئەمریکا لە دابەشکردنو چاوەدێری بەسەر هاتنەوەکایەی دەسەڵاتی سیاسیدا ئەرکێکی گرنگی لەسەرشانە.

بەگوێرەی ئەم لێکدانەوەیە لەسەر کۆمەڵگەی ئەمریکایە کە توکوڤیل خوێنەری کتێبی خۆی هەنگاوێکی دیکە لە گرنگیی تیئۆریی یەکسانیی کۆمەڵایەتی نزیك دەکاتەوە. ئەو وای بۆ دەچێ کە کاتێك کەسێك یان گرووپێکی تایبەتی بەهۆی یەکسانیی مادیو فکرییەوە ناتوانێ لۆسەکانی زاڵبوونو کەوتنە سەرەوەی هاووڵاتانی لەبەردەست دابێو کاتێك کەسێك نەتوانێ کەڵکی خراپ لە سامانو پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆی وەرگرێ، دەرفەت بۆ نابەرابەریی قانوونییش لەبەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی بەردەوام پێك-نایە. کەوابوو ماکەی لێکدانەوەی توکوڤیل ئەم جۆرەیە:" ویستی یەکسانی لە مافە سیاسییەکاندا، ئاکامی بێ ئەم لاوئەولای یەکسانیی مادییە."

بەڵام یەکسانیی سیاسی لە روانگەی توکوڤیلەوە دەکرێ بە شێوەی جۆراوجۆر وەدی بێ. رێگە چارەیەك کە زۆر رێی تێ دەچێ ئەوەیە هەموو ئەفرادی کۆمەڵگە مافی بەشداریی یەکسانو بەرابەریان لە بڕیارە گشتییە سیاسییەکاندا هەبێ. گرنگترین بوارەکانی ئەم مافانە بریتین لە : ئازادی دەربڕین، ئازادیی رێکخراوەیی، مافی هەڵبژاردن لە هەڵبژاردنی سیاسیدایە. بەڵام توکوڤیل دەنووسێ جگە لەمە رەنگە رێگە چارەیەکی دیکەش هەبێ. ئەم رێگە چارەیە سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ رێگەچارەکانی دیکە جیاوازە بەڵام دەتوانێ ببێتە هۆی یەکسانیی سیاسی. ئەم رێگەیە ئەوەیە کەسێك تەواوی مافەکانی بڕیاردان لە پاوانی خۆی بنێو تاکەکانی دیکەی کۆمەڵ لە بواری بڕیارداندا دەست لە مافە قانوونییەکانی خۆیان هەڵبگرن. توکوڤیل دەنووسێ:"ئەمن بۆ گەیشتن بە مافی یەکسانی سیاسی تەنیا دوو رێگە شك دەبەم، یان ئەوەکە هەموو هاووڵاتان خاوەنی مافی وەك یەك بن، یان ئەوەکە هیچ کەس خاوەنی ئەم مافە نەبێ. چونکە بۆ ئەو کەسانەی گەیشتوونەتە پێگەی کۆمەڵایەتی لە ئاستی ئەنگلو ئەمریکاییەکان، زۆر زەحمەتە جیاوازییەك لە نێوان دەسەڵاتی سەرەڕۆیانە دابنێن. ناکرێ بیشارمەوە ئەو پلە کۆمەڵایەتییەی باسم کرد بە ئاسانی دەتوانێ ئەم یان ئەو رێگە چارەیە وەك ئاکام قبووڵ بکا."

رێگە چارەی دووهەم واتە دەسەڵاتی یەك کەس، بەڵام یەکسانە بە سەرەڕۆیی. توکوڤیل لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەو یەکسانییە گشتییە ئەگەرچی لەراستیدا "یەکسانی



لە کۆیلەتی دا"یە، بەڵام هەرچۆنێك بێ شێوەیەك لە یەکسانیی سیاسییە. توکوڤیل پاشان پرسیارێکی دیکە دێنێتەگۆڕ: کۆمەڵگەیەکی مۆدێڕن چۆن دەتوانێ لە جیاتی" دەسەڵاتی گشتی" بەرەو دەسەڵاتی فەردیی سەرەرۆیانە بچێ؟ خۆ لە هەردووکیاندا یەکسانیی مرۆڤەکان دەتوانێ وەدی بێ. کەوابوو پرسیار ئەوەیە باشە بۆ خەڵك دەتوانن "یەکسانی لە کۆیلەتی"یان دا پێ لە "یەکسانی لە دەسەڵاتی گشتی" باشتر بێ؟ ئەو هۆیانە چن دەبنە سەرچاوەی زۆربوونی یەکسانیو لە کۆمەڵگە داو ئەویش دەبێتە هۆی لە مەترسی کەوتنی مافە سیاسییەکان؟ مەبەستی سەرەکیی توکوڤیل لە هێنانە گۆڕی ئەم پرسیارانە ئاماژە بەو مەترسیانەن کەمینیان بۆ دێموکراسیی سیاسی داناوە. توکوڤیل لەسەر ئەو باوەڕەیە خەڵکی ئاسایی بەرلەوەی لە بیری پاراستنی دیموکراسیی سیاسی دابن. لە بیری بەرگری لە یەکسانیدان. توکوڤیل دەڵێ: "هەرچەند هەموو مرۆڤەکان بە شێوەیەکی غەریزی ئازادییان دەوێ، بەڵام ژمارەیەکی کەم ئامادەن لێبڕاوانە بەرگریی لێ بکەن. لە حاڵێکدا زۆربەی خەڵك دەتوانن لە دەستدانی ئازادیی سیاسی تەحەممول بکەن." هەروەها توکوڤیل لەسەر ئەو باوەڕەیە ئازادیخوازی لە چاو یەکسانیخوازی لە بیروزەینی زۆربەی خەڵکی کۆمەڵگەدا کەمتر خەڵك بۆلای خۆی رادەکێشێ. توکوڤیل دەنووسێ: " لە حاڵێکدا وەسوەسەی ئازادی هەرچەند جاری وایە ژمارەیەك لە هاووڵاتان ئەوپەڕی چێژی لێوەردەگرن، بەڵام یەکسانی وەسوەسەیەك هەموو رۆژێ هەر مرۆڤێك وردە چێژێکی زۆری لێدەبینێ... چێژی ئازادی تەنیا ئەو کاتە بەربڵاوتر دەبێ کە مرۆڤ لە رێگەی وی دا شتێکی کردبێتە قوربانی. لە حاڵێك دا یەکسانی چێژێکە لە خۆیداو بۆخۆیەتی."

نیگەرانیەکی دیکەی توکوڤیل قوربانی کردنی ئازادی بۆ وەدەستهێنانی یەکسانییە. توکوڤیل دەنووسێ." جۆرێك نەفس نزمی لەنێو هەژارەکاندا هەیە کەوایان لێدەکا بکەونە بیری هێنانە خواری دەسەڵاتداران تا ئاستی خۆیان. سەبارەت بەوەی دەیانەوێ لە ژیانی کۆمەڵگەیەك دەرباز بن کە ژمارەیەك خاوەنی ئیمکاناتی زیاتر لە خەڵکی دیکەن." کەوابوو توکوڤیل لەسەر ئەو باوەڕەیە جاری وایە دەسەڵاتدارانی سیاسی لەگەڵ کەسانی خوارەوەو بێ

مافی کۆمەڵ یەك دەگرن تاکوو ئەو مافە سیاسیانە لە نێو کۆمەڵدا بسڕنەوە، بە تایبەتی ئەگەر دەسەڵاتداران لە چینی ئەریستۆکرات بن.

توکوڤیل دەنووسێ:" ئەمن لەسەر ئەو باوەڕەم مرۆڤە دیموکراتەکان ئەوینێکی سروشتیان بە ئازادی هەیە... بەڵام لە پێناوی یەکسانیدا دەسووتێن‌و بۆ وەدەستهێنانی بە شێوەیەکی لەرادەبەدەر کوێرەوەری دەبینن. ئەوانە خوازیاری یەکسانی لە ئازادی دان‌و ئەگەر وەدیی نەیەنن تەنانەت یەکسانی لە کویلەتیاندا پێباشترە. ئەوانە ئامادەن هەژاری تەحەمول بکەن، ئەهلی کویلەتی‌و وەحشیگەرین، بەڵام نەك لە گەڵ حکوومەتی ئەریستوکراتی."

بابەتێکی دیکە کە توکوڤیلی نیگەران کردوە بارودۆخی ناسکی کۆمەڵگەی مەدەنی لە بەرامبەر سەرەڕۆیی دایە. چونکە کاتێك یەکسانی لە کۆمەڵدا زۆر دەبێ، هۆی وەك تاك گەرایی‌و کەمبوونی هەوڵە گشتییەکان لە بەرگری لە هەلومەرجێکدا کە "تەنیا ڕێککەوتن‌و یەکیەتی‌و هاوهەنگاوی بۆ پاراستنی ئازادی پێویستە" هەر کەس بە تەنیا ناتوانێ لە بەرامبەر سەرەڕۆییدا بەرگری لە ئازادی بکا. بۆیە توکوڤیل باسی جۆرێك "ترسی ئایینی" لە بەرامبەر کەوتنە مەترسیی دیموکراسیدا دەکا کە وەك "ڕێگەیەکی ترسناك "دەتوانێ هەڕەشە لە ئازادی بکا. بۆیە توکوڤیل لە بارەی سەرنجامی دیموکراسیی سیاسی‌و سەروەریی گەلیشدا نیگەرانە. بەگوێرەی لێکدانەوەی توکوڤیل مەترسییەکی دیکەش هەڕەشە لە دێموکراسی دەکا." دیکتاتۆڕیی زۆرایەتی" لە دژی کەمایەتی  کە بریتییە لە هەڵوەشان‌و هەڵتەکانی دیموکراسیی سیاسیی لە نێوخۆدا. بە واتایەکی دیکە دڵەراوکێی فکریی توکوڤیل نەهێشتنی دوو مەترسیی گرنگ لە سەر دێموکراسییە. یەکێکیان هەڕەشەیەکە لە دژی سەروەریی خەڵك کە لە ناخی هەلومەرجی کۆمەڵایەتیدا هەیە. ئەوی دیکەشیان مەترسییەکە لە ناخی خودی سیستەمی خەڵك سالاریدا وەك" دیکتاتوریی زۆرایەتی" شاراوەیە. بەڵام بە پێی لێکدانەوەی توکوڤیل" دیموکراسی لە ئەمریکا" توانیویەتی ڕێگە چارەی پێویست بۆ نەهێشتنی هەردوو مەترسییەکە بدۆزێتەوە. بەڵام بەرلەوەی باسی ئەو ڕێگە چارانە بکەین بڕێك زیاتر لە بارەی چەمك‌و بایەخی دیموکراسیی سیاسی‌و ئاسوودەیی گشتی لە روانگەی توکوڤیلەوە دەدوێین.



## نیشتمانپەروەریی مۆدێڕن

توکوڤیلیش وەك بیرمەندانی دیکەی سەردەمی مۆدێڕن، سەرەڕۆیی‌و دیکتاتۆڕی بە یەکێك لە نەخۆشییەکانی یەکسانی کۆمەڵایەتی‌و بە "شتێکی ترسناك" دەژمێرێ. بۆچوونێکی ئەوتۆ بەومانایەیە ئەو بایەخێکی گرنگ بە دیموکراسی‌و سەرەرۆیی خەڵك دەدا. چونکە ئازادی لە روانگەی ئەوەوە نەك وەك ئامرازێك بۆ ئامانجە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکان بەڵکوو "بایەخێکی گرنگ"و شایستەیە. بەڵام توکوڤیل وەك جۆن ستوارت میل بایەخی ئازادی بە گەلاڵەی سیستەماتیکی فەلسەفی پاساو نادا، بەڵکوو بە شێوەیەکی سادە بە "بایەخێکی پیرۆز"ی دادەنێ. توکوڤیل لە پاساودان‌و شیکردنەوەی ئەم "بایەخە پیرۆزە"دا باس لە کاریگەریی ئیجابیی ئازادیی سیاسی لە وەدەستهێنانی ئاسوودەیی ئابووریدا دەکا. کەوابوو بە شداریی هەرچی زیاتری خەڵك لە رەوتی بڕیاردانی سیاسیدا لە روانگەی توکوڤیلەوە وەك" خولقێنەری شاکارێك لە ئاستی هونەری لە ژیانی بە ئازادی" دایە. شاکارێکی ئەوتۆ تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ بخولقێ کە باوەڕە دەروونییەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵگەیەکی ئازاددا بپشکوێ. یەکەم باوەڕ بە گوێرەی لێکدانەوەی توکوڤیل لە ژێر تیشکی ئازادیدا گەشە دەکا، نیشتمانپەروەری‌و روونکردنەوەی خەڵك بۆ هەوڵدان لە ڕێگەی گەشەکردنی نیشتمان دایە. ئەو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ باوەڕێکی ئاوا نیشتمانپەروەرانە زۆر زیاتر لە خۆشەویستیی نیشتمانە کە لە هەر مرۆڤێکدا بە شێوەیەکی سروشتی بۆ ئەو وڵاتەی لێی لە دایك بووە هەیە. چونکە خۆشەویستیی نیشتمان لە هەلومەرجی دیموکراسیی سیاسیدا دەبێتە سەرچاوەی وزەبەخش‌و گرێدراوی تاك بە بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگەوە. لەم پێوەندییەدا روانگەی توکوڤیل لە بارەی جۆرێك نیشتمانپەروەریی عەقڵانی دایە. ئەمە لە روانگەی ئەو " پڕ بەرهەمترو درێژخایەن تر"ە لە نیشتمانپەروەری تەنیا لە رووی سۆزەوە. لە بارەی نیشتمانپەروەریی تێکەڵ بە ئازادی‌و دیموکراسی دا توکوڤیل دەنووسێ:

" بە چەمکێکی رووناکبیرانە لە دایك دەبێ، بە یارمەتیی قانوون گەشە دەکا، بە وەدیهاتنی مافەکانی مرۆڤ زیاد دەکاو سەرەنجام لەگەڵ ئۆگریی تاکی مرۆڤ ئاوێتە دەبێ"

تۆکوڤیل نیشتمانپەروەری بە وەدیهاتنی بەرژەوەندییەکانی تاکی مرۆڤ لێك دەداتەوە، کە لە ڕێگەی وەدەستهێنانی مافە سیاسییەکانەوە گەشە دەکا. هەر لەم کاتەشدا بەشداریی تاکەکان لە کاروباری گشتیی کۆمەڵگەدا، خەڵکی لە دۆزینەوەی پێوەندیی تاك بە بەرژەوەندیی گشتییەوە ئاگادار دەکا. تۆکوڤیل دەنووسێ:" ئەمە ڕاستییەکە لە ئەمریکا وەدی هاتوە. هەربۆیە ئەمریکاییەکان بەتەنیا سەبارەت بە بەجێهێنانی ئەرك لە بەرامبەر وڵاتدا و هەستی شانازیی نەتەوەیی خۆماندوو ناکەن، بەڵکوو بە مەبەستی سەرکەوتن‌و وەدەستهێنانی قازانجە تایبەتییەکانی خۆیان کار دەکەن‌و هەوڵ دەدەن."

لە ڕوانگەی تۆکوڤیلەوە نیشتمانپەروەریی عەقڵانی تەنیا نابێتە هۆی بەهێز بوونی هەستی نیشتمانپەروەری، بەڵکوو تەنیا شێوەیەکی هاووڵات بوون لە کۆمەڵگەیەکی مۆدێڕن دایە. بۆ بەقای ئازادەمیزادیش تۆکوڤیل شی دەکاتەوە ئاڵوگۆڕی سیاسی، سکۆلاریزم‌و نەمانی پێوانە کۆنەکان بە گشتی دەبنە هۆی لاوازبوونی ئەو پێوەندییەی کە تاك تەنیا لە ڕووی عاتیفیەوە بە نیشتمانەوە هەیەتی. ئەم تێگەیشتنەی تۆکوڤیل بەرهەمی تێڕوانینەکانی وی تەنیا لە ئەمریکا نیە، بەڵکوو لە ئەزموونی سەردەمی پاش شۆڕشی فەرانسەشە. کەوابوو تۆکوڤیل ئەم پرسیارە دێنێتە گۆڕێ ئەگەر هات‌و گیانی نیشتمانپەروەریی عاتیفی لاواز بوو چۆن دەبێ نیشتمانپەروەریی کۆن‌و سوونەتیی لە جێ دابنرێ؟ چونکە بۆ مرۆڤێکی باڵغ گەڕانەوە بۆ بیرکردنەوەی سەردەمی منداڵی شتێکی نامومکینە. وەڵامی تۆکوڤیل بەم شێوەیە: " تەنیا ڕێگەی دروست بۆ پێکهێنانی نیشتمانپەروەریی عەقڵانی لەڕووی هەڵسەنگاندنەوەیە، وەدیهاتنی خەڵك سالاری‌و پەلکێش کردنی هاووڵاتان ، بە بێ وەدیهاتنی مافە سیاسییەکان نامومکینە."

لە ڕوانگەی تۆکوڤیلەوە ئازادییە سیاسییەکان نەك هەر دەبنە بە هێزبوونی نیشتمانپەروەریی عەقڵانی بەڵکوو دەبنە سەرچاوەی بەرهەمی زیاترو کاروکەسبی بە سوودتریش. ئەم لێکدانەوەیە لەو شتانەی تۆکوڤیل لە ماوەی مانەوەی لە ئەمریکادا بەچاو دیتوون‌و لە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئورووپا، سەرچاوەی گرتوە. تۆکوڤیل دەڵێ لە



ئەمریکادا دیتوویەتی هەموو چین‌و توێژەکان‌و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاست‌و چوارچێوەی جۆراوجۆردا چۆن خەریکی کاروتێکۆشانێکی ماندوو نەناسانەن. دەنووسێ:" مرۆڤ هێشتا لە ئەمریکا پێ لە سەر زەوی دانانێ خێرا خۆی لە قەرەباڵغیی کاروتێکۆشاندا دەبینێتەوە...و هەست بە جیاوازییەکی زەق دەکا کە لە نێوان نەتەوەیەکی ئازادو نەتەوەیەکی ژێر دەسەڵاتی دیکتاتۆڕیدا هەیە. لە حاڵی یەکەم ( ئازادی) دا کێشەکە لەسەر باشترکردن‌و هەڵدان‌و گەشەکردنە. بەڵام لە حاڵی دووەم دا خەڵك دوای تێکۆشانی ڕۆژانە وەدوای شتێکی دیکە جگە لە حەسانەوە ناکەوێ."

تۆکوڤیل باشبوونی ئاسوودەیی گشتی بە بەرهەمی نیشتمانپەروەریی مۆدێڕن‌و ئاکامە ڕاستەوخۆکانی ئازادیی سیاسی دەزانێ. تۆکوگیل دەنووسێ:

"گرنگترین خزمەتی حکوومەتێکی دیموکرات ئەوەیە هەلومەرجێك بۆ خەڵك پێك بێنێ کە بەرهەم‌و دەسکەوتی کارەکانیان لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا زۆر زیاتر لە هی ئەو هەلومەرجەیە کە لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتێکی دیکتاتۆڕدا دەتوانن بەرهەمی بێنن."

بەبۆچوونی تۆکوڤیل حکوومەتی سەرەڕۆ هەستی چاکەو کارو تێکۆشان لە مرۆڤ دا دەکوژێ. دەنووسێ:"کاتێك مرۆڤ لە وڵاتێکی دیموکراتیکەوە دەچێتە وڵاتێکی دیکتاتۆڕ لێدراو هەست بە شتێکی سەیر دەکا: لە وڵاتێکدا دیکتاتۆڕی هەیە تەواوی کاروتێکۆشان‌و جموجۆڵەکان بە شێواوی دێنەبەرچاو."

تۆکوڤیل وەك نموونە ئاماژە بە "جموجووڵی لە ڕادەبەدەری پیشەسازییە جۆراوجۆرەکان" لە ئەمریکادا دەکاو وەك موعجیزەی دێموکراسی ناوی دەبا. تۆکوڤیل دەنووسێ: "موعجیزەی دیموکراسی بەرهەمی قانوون نیە بەڵکوو شتێکە خەڵك لە هەلومەرجی دیموکراسیدا خوڵقاندوویانە." بۆیە گرنگترین سوودی حکوومەتی دیموکراتیك لە ڕوانگەی تۆکوڤیل ئەوەیە کە بەکاربوونی هەر سیستەمێك بەستراوەتەوە بە تاکی مرۆڤەوە. هەرچی مرۆڤ بەکارتر بێ، ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسییش بە گشتی بەکار دەبن. کەوابوو دیموکراسی بەکردەوە دەبێتە هۆی نیشتمانپەروەریی ڕاستی‌و جموجووڵ‌و بەکاربوونی زیاتری هاووڵاتان‌و کۆمەڵگە. بە

گوێرەی ئەم ئیستیدلالەیە کە توکوڤیل پێ لەسەرئەوە دادەگرێ نەبوونی پارێزگاریی جیددی لە ئازادیو دیموکراسی ئاکامی زۆر خراپی بۆ تاکو کۆمەڵ هەیەو بەو ئاکامە دەگا کە:" حکوومەتی سەرەڕۆ هەرچەشنە کاراییو مەیلی چالاکیی داهێنەرانە لە مرۆڤەکاندا دەکوژێ."

## سەرەڕۆیی زۆرایەتی

یەکێکی دیکە لەو مەسەلانەی توکوڤیلی لە کەوتنە مەترسیی ئازادی نیگەران کردوە، ئەگەری خراپ کەڵك وەرگرتن لە ئازادییە. ئەو دەنووسێ:"مرۆڤ دەتوانێ لە ڕێگەی بەزاندنی سنووری دادپەروەریو عەقڵ کەڵکی خراپ لە ئازادی وەرگرێ."

توکوڤیل باسێکی وردو بەربلاوی لە بارەی "سنوورەکانی عەدالەت"دا هێناوەتە گۆڕ. کاکڵی باسی توکوڤیل ئەوەیە گرنگترین مەترسی کە دەتوانێ سنوورەکانی عەدالەت لەلایەن حکوومەتێکی دیموکراتیکەوە خەوشەدار بکا، " سەرەڕۆیی زۆرایەتییە." ئەو مەترسییە سەبارەت بەوە زۆر گرنگە بە پێی قانوونو عوورفی دیموکراتیك پرەنسیپی" دەسەڵاتی زۆرایەتی"و ویستی زۆرایەتی دووره دیمەنی دیموکراسی پێك دێنی. توکوڤیل کە لایەنگرێکی خەستی خەڵك سالاریودێموکراسییە، بە ئاشکرا ڕەخنە لە پرەنسیپی دەسەڵاتی زۆرایەتی دەگرێ. دەنووسێ:" ئەمن لە سەر ئەو باوەڕەم ئەوە بۆچوونێکی بێزار و ئەو کوفرە کە زۆرایەتی هەرچی پێی خۆشە بیکا."

توکوڤیل لەبەرئەوەی دڵەراوکێی وی بەرگری لە ئازادی بوو، لە پێناوی وەدیهاتنی ئازادیی واقعیدا خوازیاری سنووردارکردنی چوارچێوەی گەمەی ئازادییە. ئەو دەپرسێ:"ئایا سەرەڕۆیی زۆرایەتی پێشێل کەری مەبەست نیەو دژی ئازادی نیە؟ " لە ڕوانگەی توکوڤیلەوە ڕێگە چارەی ناکۆکیی نێوان دەسەڵاتی زۆرایەتیو ئەگەری خراپ کەڵك وەرگرتنیو لەنێو چوونی عەدالەتو ئینساف هەیە، بریتییە لەوەی "قانوونێکی بەربلاو لە سەر بنەمای ئیرادەی زۆرایەتیی مرۆڤایەتی دامەزرابێ" لەم بارەیەوە دەنووسێ:



"ویستی زۆرایەتی لە هەر کۆمەڵێکی دیاریکراودا دەبێ پێڕەوی قانوونی بەربلاوی مرۆڤایەتی بێ. قانوونێکی ئەوا بەربلاو نەك هەر لە سەر بنەمای ویستی زۆرایەتیی خەڵك یان چەند وڵات بەڵکوو دەبێ لە سەر بنەمای ویستی زۆربەی مرۆڤایەتی بێ. قانوونێکی ئەوتۆ ناوی "عەدالەت"ە. کەوابوو عەدالەت مافی گشتیی هەموو نەتەوەکان دەگرێتەوە."

توکوڤیل لە سەر وردەکارییەکانی نێوەڕۆکی" قانوونی بەربلاو لە سەر بنەمای ئیرادەی زۆربەی مرۆڤایەتی" ناڕوا. بەڵام فکرەکەی بە "قانوونێکی سروشتی" ناو دەنێ کە لە سەرەوەی مافە ئیجابییە گشتییەکان لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکاندایە. ئەو هەروەها پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ:" هەرچەشنە بەکارهێنانێکی دەسەڵات ـــ چ سەرەڕۆیی بێ چ دیموکرات ـ بە بێ ڕێزگرتن لە قانوونە نەنووسراوە کۆمەڵایەتییەکانو بێ وەبەرچاو گرتنی ڕێوشوێنی کۆمەڵگەی مەدەنی مەشرووعیەتی نیە." کەوابوو نیگەرانیی سەرەکیی توکوڤیل خنکاندنی ئازادی لە ژێر ناوی" دەسەڵاتی زۆرایەتی" دایە کە بەوتەی وی دەتوانێ ببێتە ئامرازێك بە مەبەستی دیکتاتۆرییو ملهوری بۆ وەدیهێنانی ویستی زۆربە لە دژی کۆمەڵگەی مەدەنی. هەروەها توکوڤیل زیاد دەکاو دەڵێ:" هەرچەند لە حکوومەتی دیموکراتیکی ئەمریکادا مەترسییەکی ئەوتۆ ئێستا لەگۆڕێدا نیە، بەڵام هیچ دەستەبەرێکیش لە دژی سەرەڕۆیی نیە."

توکوڤیل لە درێژەی بۆچوونەکەیدا گرنگترین تایبەتمەندیی حکوومەتی سەرەڕۆ بە "تیرۆری فکری" دەزانێ. دەنووسێ:" خنکاندنی ئەندێشەو بۆچوونە دیاریکراوەکان بە هۆی بەکارهێنانی توندوتیژیو ملهوری گرنگترین شێوەی بەکارهێنانی سەرەڕۆییە. توندوتیژیی جەستەیی بە مەبەستی بەربەرەکانی لە گەڵ ئازادیی دەربڕینی کەمایەتی بۆ وێنە پێشگیری لە دەرچوونی ڕۆژنامە بە ئازادی یان کاری ڕۆژنامەنووسان لەو نموونەگەلەن لە ئەمریکاش وێنەی هەبووە.... لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا دەبینین حکوومەتێکی دیموکراتیكو خەڵك سالار چۆن دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر شێوەی سەرەڕۆیانە."

توکوڤیل باسی دوو جۆر سەرەڕۆیی ئاشکراو شاراوە دەکا، بەڵام لە هەردووکیان دا پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ تیرۆری فکریی ئەو کەسانەی لەگەڵ بۆچوونی ڕۆژایەتی

هاودەنگ نین، خاڵی هاوبەشی هەردووکیانە. سەرەڕۆیی ئاشکرا بریتییە لە بەکارهێنانی توندوتیژیو ملهوڕی جەستەیی بەمەبەستی پێشگیری لە ئازادیی دەربڕینی ئەندێشەی کەمایەتی. سەرەڕۆیی شاراوە بریتییە لە فشاری رووحی یان هەوڵدانی زۆرایەتی بۆ یەکدەنگ کردنو یەکڕەنگ کردنی ئەندێشەکانە. توکوڤیل جیاوازی لە نێوان ئەو دوو سەرەڕۆییە دادەنێو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ حاڵەتی دووەم واتە فشاری گرووپێك لە دژی کەمایەتی بە تایبەتی لەو مەترسییە گەورانەیە کە لە هەر حکوومەتێکی دیموکراتیكو خەڵك سالاریشدا دەتوانێ ئازادی بخاتە مەترسییەوە.

## شوڕاکانی شار Local goremment

توکوڤیل پاش شیکردنەوەی ئەو مەترسییە جۆراوجۆرەی هەڕەشە لە ئازادی دەکەن دەچێتە سەر ئەزموونی سیاسیی ئەمریکاو دەڵێ:" ئەوان بە باشی توانیویانە خۆیان لە شەڕی سەرەڕۆیی رزگار بکەن." بە پێی تێگەیشتنی توکوڤیل تەنیا لە رێگەی حکوومەتە ناوچەییە ئۆتۆنۆمییەکانی ( شووراکانی شار ) ەوە دەکرێ ئەو مەترسیانە بووچەڵ بکرێنەوە کە لە سەر رێگەی حکوومەتی دیموکرات کەمینیان داناوە. توکوڤیل دەڵێ:" حکوومەتی دیموکراتیكو خەڵك سالار کاتێك دەتوانێ لە چوارچێوەی سنوورەکانی عەدالەتو عەقڵ دا بە شێوەیەکی سەقامگرتوو هەم دیموکراسی بپارێزێو هەم وێڕای ئەمەش بیکاتە نیهادێك کە کەڵك لە نیهادی خودموختاری ناوچەیی وەربگرێ."

بەڵگەی توکوڤیل ئەمەیە: حکوومەت یان خودموختاریی ناوچەیی لە پێکهێنەرەکانی حکوومەتێکی دیموکراتیکە. بەشداریی گشتیو وەدەستهێنانی مافی سیاسیو مافی دەنگدان لە هەڵبژاردنی سەرانسەریدا دەتوانێ ببێتە هۆی ئۆرگانێکی ناوەندیی خەڵك واتە پارلمان. بەڵام ئەم ئۆرگانە لە هێندێك ئاستی دیکەدا مافە سیاسییەکانی هاووڵاتان لە چوارچێوەی ژیانیاندا دەستەبەر ناکا. بە واتایەکی دیکە نیهادی نەتەوەیی پارڵمان مەرجی پێویست بەڵام کەمە بۆ دابین کردنو دەستەبەر کردنی



مافی خەڵك. بە تایبەتی ناتوانێ مافی خەڵك لە شوێنی ژیانی رۆژانەیاندا دابین بکا. بۆیە دەبێ بۆ تەواوکردنی نیهادی پارڵمان دەبێ نیهادێکی دیکە لە ئاستی ناوچەییدا پێك بێ. ئەم نیهادە دەکرێ ناوی لێ بنرێ شووراکانی شار یان پارڵمانی ویلایەتی.

توکوڤیل بەگشتی لەسەر ئەم باوەڕەیە دەسەڵاتی سیاسی هەم لە سیستەمی سیاسیی دیموکراتیك داو هەم لە سەرەڕۆیی دا بە دوو شێوە دەکرێ لە دوو ئاستی ناوەندیو ناوچەیی دا دابەش بێ . شێوەی یەکەم ئەوەیە نیهادی بڕیاردەری ناوەندی بەکاروبارێك رابگا کە ئەو کاروبارە لە هەر هەلومەرجێکدا تەنیا لە چوارچێوەی ناوەنددا دەکرێ چارەسەر بێ. لەم بارەیەوە توکوڤیل ئاماژە بە " قانووندانان لە بارەی کاروباری گشتیو پێوەندیی خەڵك لە گەڵ دەوڵەتانی دەرەوەدا"دەکا. بەڵام کاروبارەکانی دیکە پێوەندییان بە ژیانو کێشەکانی خەڵکی هەر شارو ویلایەتێکەوە هەیە. ئەم کاروبارە دەبێ بە ئۆرگانە ناوچەییەکان بسپێردرێ. کەوابوو بە گوێرەی روانگەی توکوڤیل لەم حاڵەتەدا ئۆرگانە ناوەندییەکان تەنیا"خاڵو پرەنسیپە گشتییەکانی بەرێوەبردنی وڵات" رێك دەخەنو خۆ لە دەستێوەردانو لە "وردە کارییەکانو چۆنیەتیی کاروبارەکان" دەپارێزن. شێوەکەی دیکەی بڕیاردانو بەرێوەبردنی کاروبارەکانی وڵات بەم شێوەیە کە نیهادی ناوەندی راستەوخۆ دەست دە کاروباری ویلایەتەکانو هەروەها شارەکان وەردەداو چوارچێوەی دەسەڵاتو کردەوەکانی خۆی لە کاروباری ناوەندیو سەرانسەرییەوە تا کاروباری شاریو بەرێوەبردن فرەوان دەکاتەوە. لەم حاڵەتەدا ئێمە لەگەڵ سیستەمێکی" مەرکەزگەرای ئیداری" بەرەڕووین کە تەواوی دەسەڵات لە ناوەند کۆ بۆتەوە.

توکوڤیل پاش شیکردنەوەی سیستەمی سیاسیی دیموکراتیکی ئەمریکا بەو ئاکامە دەگا کە لە سیستەمێکی خەڵك سالاردا ناتوانێ جیاوازییەکی جیددی لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەی سەرەوەدا بەدی بکەی. چونکە ئەو وڵاتەی خاوەنی حکووومەتێکی مەرکەزیە بێئەوەی ئەو حکوومەتە دەست  دەکاروباری نێو خۆی ویلایەتەکانو شارەکان وەربدا. دەستووری ئەمریکاش پێی لە سەر ئەم شتە داگرتوە دەبێ جێبەجێ کردنی کاروباری ویلایەتەکانو شارەکان لە لایەن نوێنەرانی ئەو

ویلایەتانەوە بێ. توکوڤیل پاش بەراوردکردنی فەرانسەو ئەمریکا پێلەسەر ئەوە دادەگرێ دابەشکردنێکی بەم شێوەیەی دەسەڵات لە سیستەمی سیاسیی ئەمریکادا هۆی سەرەکیی نەبوونی سەرەرۆیی لەم وڵاتەدایە. هەربۆیە ئەو مەترسیانەی هەڕەشە لە ئازادی لە ئەمریکا دەکەن بەو سیستەمە بڕیاردانە عەقڵانییە چارەسەر کراوە. لەبەرئەمەیە بەگوێرەی بۆچوونی توکوڤیل ئەگەری خراپ کەڵك وەرگرتن لە ئازادی لە ئەمریکادا بە شێوەیەکی جیددی کەم بۆتەوە.

یەکێکی دیکە لە هۆیەگرنگەکانی پێداگرتنی توکوڤیل لەسەر گرنگیی سیستەمی شوورایی یان حکوومەتی ناوچەیی، مەسەلەی مەرجەکانی بەشداریی سیاسیی خەڵکە. ئەو دەڵێ لە سیستەمی بڕیاردانی مەرکەزیدا هەرلە جێدا زۆربەی خەڵك کەمتر حەزیان لە بەرگریکردن لە مافە سیاسییەکانی خۆیانە. چونکە بەشداری لە هەڵبژاردنو دەنگدان بە نوێنەراندا بە مەبەستی پاراستنی مافە سیاسییەکانی خەڵك بە تەنیا بەس نیە. توکوڤیل دەنووسێ:" شووراکانیو ئۆرگانە خودموختارییەکانی ناوچەیی، بناخەی ئازادین، هەروەك قوتابخانەی سەرەتایی بناخەی فێربوونی زانستە. نەتەوەیەك دەتوانێ بە بێ نیهادی شوورا خاوەنی ڕێبەرایەتییەکی دیموکرات بێ بەڵام لە رووحی ئازادی بێبەش دەبێ." توکوڤیل پێلەسەر ئەوە دادەگرێ:" بەکارهێنانی سەرەرۆیی لە سەر ئەو میللەتەی خوویان بە بەشداری لە کاروباری نێوخۆیی خۆیانەوە گرتوە، زۆر زەحمەتە." دیارە توکوڤیل بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی هەوڵ نادا نموونەو زانیاری مێژوویيو کۆمەڵناسانە بێنێتەوە. بەڵام مەنتیقو ئەزموونی جۆراوجۆر راستیی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ. کەوابوو توکوڤیل سیستەمی شوورایی حکوومەتی ناوچەیە لە بەرامبەری خەڵك سالاریو پێویستی دەسەڵاتی سیاسیی دەوڵەت دانانێ بەڵکوو بە تەواوکەرو دەستەبەری خەڵك سالاری بەگشتی دادەنێ. توکوڤیل ئیستیدلالێکی دیکەش بۆ سەلماندنی گرنگیی خودموختاریی ناوچەییو شووراکانی شار وەك دەستەبەری ئازادیو دیموکراسی دێنێتە گۆڕێ. ئەو لە سەرئەو باوەڕەیە بەشداریی خەڵك لە شووراکانی شاردا دەبێتە هۆی پەروەردە بوونی فکرو زاڵبوون بە سەر رووحیەی تاكگەرایی هاووڵاتاندا.



چونکە ئەو پێیوایە یەکێك لە ئاکامەکانی نایەکسانی بریتییە لە پەروەردەبوونی رووحیەی تاكگەراییو خۆدزینەوە لە کاری بە کۆمەڵە. بۆیە شوورا دەتوانێ ڕێگەی هەڵدانی تاك-گەرایی بگرێو خەڵك بۆ کاروبەرپرسایەتیی بە کۆمەڵ هان بدا.

توکوڤیل دەنووسێ:" کۆمەڵگەو شارە گەورەکان مرۆڤەکان بەرەو تەریككەوتنەوەو جیاوازیخوازی لە هاونەوعەکانی خۆیان پاڵپێوەدەنێو جۆرێك کۆمەڵگەی بچووكو لە پاڵخۆدا لەو کەسانە پێكدێنێ کە کاتی خۆیان تەنیا لەگەڵ بنەماڵەو هاورێ نزیکەکانیان تێپەڕ دەکەن...خۆبەزلزانی بە پێچەوانەی تاكگەرایی لە غەریزەی کوێرکوێرانەی مرۆڤەوە سەرچاوە ناگرێ، بەڵکوو لە هەلومەرجە دیاریکراوەکانی کۆمەڵگەوە سەرچاوە دەگرێو زەمینە بۆ پەراوێزخوازی پێكدێنێو دەیکاتە شتێکی سروشتی. تاكگەرایی بەرهەمی گەشەکردنی مادیو زەینیی کۆمەڵە. مەیلێکی ئەوتۆ لە کۆمەڵگەی ئەریستۆکراتدا نەبوو. چونکە لە ناخی ئەریستۆکراسیدا جۆرە تۆڕێکی بەرەویەك چوون (هەمگرایی ) لە نێوان مرۆڤەکاندا پێك هاتبوو کە سەبارەت بەوەی مرۆڤەکان پێویستیان بە یەکترە، بەیەکەوەی دەبەستنەوە. تۆڕێکی ئەوتۆ کە لەسەر پێویستیو هەستکردن بە بەرپرسایەتی دامەزرابوو، پێشی بەوە دەگرت مرۆڤ بە تەواوی لە چوارچێوەی بنەماڵەو هاورێ نزیکەکانیدا بمێنێتەوە."

توکوڤیل باسی ئەوە دەکا کۆمەڵگەی مۆدێڕن دوو ئاڵوگۆڕی بنەڕەتیی لەو هەلومەرجەی سەرەوە پێك هێناوە. یەکەم، دابڕان لە سیستەمی فئۆدالی بۆتە هۆی دابڕان لە پێوەندیی پتەوی مرۆڤ . مافی هەڵبژاردنو سنووورداربوونی کاتی مرۆڤەکان لە کۆمەڵگەی مۆدێڕندا، کۆتایی بە سەردەمی کۆمەڵگەی جەماوەری هێناوە. هەروەها سەرهەڵدانی چینی نوێ بۆتە هۆی ئەوەی تاکەکانی هەر چینێك بەرەو هەمان چینەکەی خۆیان پەلکێش بکرێنو بە چاوی نەناسیاو سەیری ئەوانی دیکە بکەن. دووهەم، هاوکێشیو یەکسانیی کۆمەڵایەتیی سەردەمی مۆدێڕن ئیمکانی مادیی پێویستی بۆ زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵ بە مەبەستی ژیانی سەربەخۆیانە پێك هێناوە. لە سەردەمی نوێدا ئیدی کەم وایە یەکێك بۆدابین کردنی بژیوی خۆی موحتاجی خەڵکی بێ.

سیستەمی ئەریستۆکراسی کە لەسەر بنەمای کۆمەڵگەی جەماوەری دامەزرابوو، پێویستیی بە هاوکاریی جەماوەر بوو، تێك رووخا. ئیدی هیچ کەس لە بەرامبەر ئاغاو بەگدا هەست بە گوناهو قەرزداری ناکا. خەڵکیش لە بەرامبەر یەکتردا پێویستیی بە هەستی هاوپێوەندیو پێویستیی ماددی نیە. کەوابوو هەرکەس بەگوێرەی حەزی دەروونیی خۆی هاورێو پێوەندییە خۆشەویستییەکەی هەڵ دەبژێرێ. هەر ئەو هەستەشە بۆتە هۆی تەریك کەوتنەوەو جیایی مرۆڤەکان لە یەکتری.

لەوەی باسی کرا توکوڤیل بەو ئاکامە دەگا هەرچی تاکگەرایی لە کۆمەڵگەدا زیاتر پەرەبگرێ، کۆمەڵگەش بە گشتی لەبەرامبەر مەترسیی سەرەرۆییدا لاواز دەبێ. لە هەلومەرجێکی وادا ئەو مەترسییە هەیە خەڵك یەکسانیی لە کۆیلەتیدا پێ لە یەکسانی لە ئازادیدا باشتر بێ، بەتایبەتی لەبەرئەوەی لە کۆمەڵگەی مۆدێڕندا جۆرێك پاسیڤ بوونی گشتیو پچڕانی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەدی دەکرێ. کەوابوو دیفاع لە کاری هاوبەش کەمتر سەرنجی گشتیی پێدەدرێ. بە پێی بۆچوونی توکوڤیل ئەم هەلومەرجە راست ئەو شتەیە سیستەمێکی سەرەرۆ پێیخۆشە. ئەو دەنووسێ:" سەرەرۆییو ئەوانەی خۆیان لە جێی دادەنێن despotism کە پێی خۆشە مرۆڤ تەریك کەوتەبێ، لە پەنا ئەمەدا جێگەی خۆیان پتەو دەکەنو خەڵکی بەرەو تەریككەوتنەوەو دابڕان پاڵپێوە دەنێن. سەرەرۆیی، ئەو کەسانەی توانای خۆیان لە رێگەی بەختەوەریی هاوبەشدا بەکاردێنن، ناویان دەنێ ئاژاوەگێڕو رووحی نائارام. بەڵام بەو کەسانەی لە رێگەی پێکهێنانی تەفرەقەو چەند قۆڵیو سەردەبەرخۆنانی مرۆڤەکاندا هەوڵ دەدەن بە هاووڵاتە باشەکانیان ناو دەبا. ئەو ئاژاوەیەی سەرەرۆیی دەی خولقێنێ، هەر ئەمەیە کە یەکسانی ( کۆمەڵگەی مۆدێڕن) لە ناخی مرۆڤەکاندا بە هێزی کردەوە. بۆیە هەردووکیان تەواوکەری یەکترن:"

لە روانگەی توکوڤیلەوە رێگە چارەی زاڵبوون بەسەر خۆتەریك کردنەوەو تاکگەرایی کۆمەڵگەی مۆدێڕندا ئەوەیە کە هاووڵاتان خاوەنی بەرزترین ئاستی مافە سیاسییەکان بن. توکوڤیل پێلەسەر ئەوە دادەگرێ کە:" تەنیا یەك رێگە چارەی کاریگەر لە دژی ئەو زیانانەی کۆمەڵگەیەکی مۆدێڕن پێکیان دێنێ هەیە، ئەویش ئازادیی سیاسییە." بە



پێچەوانەی دیسپۆتیستەکان کە هاوچەشن کردنیان پێ چاکەیە، بەشداریی سیاسی دەبێتە هۆی شان خستنە بەر بەرپرسایەتیو ئۆگری لە کۆمەڵگە دا زیاد دەکا. چونکە کاتێك خەڵك بۆ بەرێوەبردنی کاروبارە کۆمەڵایەتییەکانو کارە هاوبەشەکانیان ڕابکێشرێن، بە ناچار لە دۆخی تاکیو تایبەتیی خۆیان دێنەدەر. ئەوان بۆیان دەردەکەوێ پێویستیان بەیەکترەو بایەخ بە هاوکاریو پێویستیی دوولایەنە دەدەنو خۆ لە بە بێگانەزانینی یەکتر دەپارێزن، پاش ئەم شیکردنەوانەو هێنانەگۆڕی ئەم پرسیارەی کە چۆن دەکرێ هاووڵاتان بەرەوکاری کۆمەڵایەتی رابکێشرێن، وەڵامی توکوڤیل روونە:" شووراکانی شارو خودموختاریی ناوچەیی." چونکە پێوەندیی بە بڕیاردان لە بارەی کاروباری ژیانی رۆژانەی خەڵکەوە هەیە ، زۆرترین شانسیان بۆ راکێشانی هاوکاریو بەشداریی هاووڵاتان هەیە. ئەمە بوارێکە هاوڵاتان دەتوانن کاری هاوبەشی کۆمەڵایەتیی تێدا بکەنو هەروەها پێویستبوون بەیەکتریان بۆ دەردەکەوێ. توکوڤیل پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە بڕیاردان لە کاری ناوەندیو سەرانسەریدا کەم وا هەیە بتوانێ هاوڵاتان بۆ پێوەندیو هاوکاریی نزیك لەگەڵ یەکتر رابکێشێ. بەڵام "شوراکانی شارو ناوچە راست بە پێچەوانە دەبێنە هۆی پێوەندیی تایبەتیو نزیکی زۆری تاکەکان لەگەڵ یەکترو هەستی عەلاقەو ئۆگریی هاووڵاتان بە بەختەوەریی گشتیی کۆمەڵ وەخەبەر دێ."

کەوابوو شووراکانی شارو ناوچە لە روانگەی توکوڤیلەوە خاوەنی چەند تایبەتمەندیی گرنگن: بەرگری لە ئازادیی سیاسیو دەستەبەری دیموکراسی لە بەرامبەر مەترسیی سەرەرۆییدا، هەروەها وەك دژە ژەهرێك بۆ زاڵبوون بەسەر ژیانی کۆمەڵگەی مۆدێڕندایە. بەڵام جگە لەمانە شووراکانی شار لە روانگەی توکوڤیلەوە گرنگییەکی دیکەشیان هەیە، ئەویش پێشگیری لە خراپ کەڵك وەرگرتن لە ئازادیو بەزاندنی سنووری عەدالەتو عەقڵە. چونکە نیهادە ناوچەییەکان دەبێنە هۆی پەروەردە بوونی هاووڵاتان بە رووحی هاوپێوەندی و بەهێزکرکردنی رووحی هاوکاریو هەستکردن بە ئۆگری. گرنگییەکی دیکەی شووراکانی ناوچە لە روانگەی توکوڤیلەوە، بریتییە لە پێگەی وان لە دوور خستنەوەی مەترسیی سەرەرۆیی زۆرایەتییە. چونکە خودموختاریی ناوچەیی بەکردەوە

دەبێتە کۆسپی سەر ڕێگەی بڕیاری ناوەندو بەکارهێنانی دەسەڵاتی ناوەند لە کاروباری ناوچەیی‌و شاردا. ئۆرگانە ناوچەییەکان سنووری بەکارهێنانی دەسەڵاتی ناوەندی لە ئاستی شارو ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا سنووردار دەکا. چونکە شووراکانی شار باشترین کۆسپن لە بەرامبەر ئیمکانی کۆنترۆڵو بەکارهێنانی دەسەڵاتی ئیداری‌و بەرێوەبەریی ئۆرگانەکانی دەسەڵاتی مەرکەزیدا لە ئاستی ناوچەیی. لە سنووری ناوچەیی‌و شاردا ئەوە شووراو ئەنجوومەنە خوودموختارەکانن کە دەسەڵات بەکار دێنن‌و مەیدان بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتی ناوەندی نامێنێتەوە. توکوڤیل دەنووسێ." کاتێك دەسەڵاتی ناوەندی کە نوێنەری بەرژەوەندیی زۆرایەتییە، ئەگەر بیەوێ دەسەڵاتی بەرێوەبەری لە ئاستی ناوچەییشدا بەکار بێنێ، کارێکی ئەوتۆی هەموو وەختێك بۆ نالوێ. شووراکان‌و ئۆرگانە ناوچەییەکان وەك گابەردێکی نادیارن کە پێش بە ئاوو شەپۆلە بەتەوژمەکانی ویستی گشتی دەگرن‌و ڕای‌دەگرن یان لە تەوژمەکەی کەم دەکەن. هەرچەند دەسەڵاتی زۆرایەتی پشتیوانیی قانوونیشی لە پشتە. بەڵام هەر چۆنێك بێ بەرێوەچوونی قانوون لە کاتێکدا شووراکان‌و ئەنجوومەنە ناوچەییەکان دەتوانن ئازادی لە مەترسیی بەتاڵان چوون بپارێزن."

دیارە دەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێ ئەو ڕێگە چارەیەی توکوڤیل بۆ پێشگیری لە سەرەڕۆیی زۆرایەتیی دا باسی دەکا، بەکردەوە لەگەڵ ئەوەی لە دەستووری سیستەمی سیاسیی ئەمریکا هاتوە، جیاوازە. چونکە دەستووری ئەمریکا لەسەر بەرێوە چوونی ویستی زۆرایەتی، یەك لەوان لەسەر قانوونی ویلایەتە جۆراوجۆرەکان لە مەسەلە گرنگ‌و سەرەکییەکان دامەزراوە. بەڵام دڵەراوکێی زەینیی توکوڤیل لەو ڕستانەی سەرەوەدا بریتییە لە پاراستنی ئازادیی سیاسی‌و پێشگیری لە خراپ کەڵکوەرگرتن لە ئازادی بە ناوی حکوومەتی زۆرایەتییە بەکردەوەو لە ڕووی مافەوە.

ئەگەر بمانەوێ بە کورتی سەیری ئەندێشەو دڵەراوکێی توکوڤیل بکەین دەتوانین بڵێین شیکردنەوەی وی لە بارەی ئەزموونی دیموکراسی لە ئەمریکادا ڕوانگەیەکی کۆمەڵناسانەیە نەك فەلسەفی. ئەو زۆر بە باشی کەڵك لە زانیاری‌و بەڵگە جۆراوجۆرەکان وەردەگرێ بۆ سەلماندنی فکرو شێوەی بیرکردنەوەو ئەندێشەی ئازادیخوازانەی خۆی. توکوڤیل لە ڕێگەی



خوێندنەوەی ئەو " شۆڕشە کۆمەڵایەتییەی" لە ئەمریکادا وەدی هاتوەو بۆتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی مۆدێرن لە بوارەکانی مادی، فکری‌و یەکسانیی سیاسیدا، بەو ئاکامە بنەڕەتییە دەگا دەبێ بەکسانیی کۆمەڵایەتی‌و حکوومەتی دیموکراسی پێکەوە هەبن. وەدیهاتنی ئەم دووانەش لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی سەرمایەداریی مەوجوودا بە تەواوی ئیمکانی هەیە. توکوڤیل لە سەر ئەو باوەڕەیە کۆمەڵگەی مۆدێرن بەردەوام دەبێ لە دەستەبەرکردنی مافی تاکدا هەوڵ بدا، بۆئەوەی ئازادیی تاك لە هەر هەلومەرجێك دا بپارێزرێ. هەر لەم کاتەشدا دەبێ لە نێوان ئازادی‌و یەکسانیدا پێوەندییەك دروست هەبێ . وابێ هیچ کامیان مەترسیی بۆئەوی دی نەبێ. توکوڤیل باس لە هاوکێشییەکی زەریف لە نێوان ئازادی‌و یەکسانیدا دەکا. چۆن دەکرێ بیرێك لەوە بکرێتەوە بۆئەوەی سەبارەت بە نابەرابەریی کۆمەڵایەتی کە هەرچۆنێك بێ حاشای لێ ناکرێ، کەسێك ئازادی‌و ئاسایشی کەسێکی دیکە نەخاتە مەترسیەوە. توکوڤیل بە توندی نیگەرانی سەرەڕۆیی زۆرایەتی‌و هەروەها ڕێبەرانی نالایقە. کەوابوو، باشترین ڕێگەی پێشگیری لەوەی ئازادی نەکەوێتە مەترسییەوە، نەهێشتنی مەرکەزییەتی دەسەڵاتی سیاسییە. توکوڤیل پێ‌لەسەر ئەوە دادەگرێ خودموختاریی ناوچەیی‌و شووراکانی شار باشترین ڕێگەی پارێزگاری لە ئازادی‌و دەستەبەری پێشگیری لە سەرەڕۆییە.

# چەمکەکانی قەهرو دەسەڵات لە فەلسەفەی

# سیاسیی هانا ئارێنت دا

**ن: بەهرامی موحیبی**

هانا ئارێنت Hannah Arendt زانای ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٠٦ دا لە هانۆڤەر لە دایك بوو. لە زانستگەکانی ماربۆرگو فرایبۆرگ لە ژێر چاوەدێریی ماموستایانی وەك هایدگر و کارول یاسپرێس دا خەریکی خوێندنی فەلسەفە بووو دوکتۆرای فەلسەفەی وەرگرت. بە زاڵبوونی فاشیزم لە ئەڵمان، قۆناغی راوەدوونانو ئاوارەیی ویش دەستی پێکردو ناچاری کرد زێدو نیشتمانی خۆی بەجێبێڵێ. ئارێنت لە پێشدا چووە پاریسو پاشان لەوێڕا کۆچی کرد بۆ ئەمریکا. لە زۆربەی زانستگەکانی ئەمریکا خەریکی گوتنەوەی فەلسەفە بووو کۆمەڵێك بەرهەمی فەلسەفی ـــ سیاسیی بەنرخی بەیادگار لە پاش بەجێ مان. لە بەرهەمەکانی دەتوانین ئاماژە بە "توخمەکانو سەرچاوەکانی حاکمیەتی تەواو"، (١) "راستیو درۆ لە سیاسەتدا"،(٢)" لەبارەی شۆرشەوە"(٣)و " دەسەڵاتو قەهر"(٤) بکەین. هانا ئارێنت لە ساڵی ١٩٧٥دا لە نیۆیۆرك کۆچی دوایی کرد. ئارێنت لە بەناوبانگترین نامەی فەلسەفی ـــ سیاسیی خۆی، واتە " دەسەڵاتو قەهر"دا، بەسەرنجێکی وردو کەم وێنەوە، رۆڵی دەسەڵاتو قەهری لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەڵسەنگاندوە. بۆخۆی هۆی ئەم لێکۆڵینەوەیەی بردۆتەوە سەر ناروونیی چەمکەکانی وەك دەسەڵات بەتایبەتی قەهر کە نێوەرۆکەکەیان لە زۆربەی فەلسەفە ساسییەکانی هاوچەرخدا بە ناروونیو لە تاریکیدا ماونەتەوە. ئەو باسی ئەوە دەکا کە مەسەلەی قەهر لە لێکۆڵینەوە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکاندا زۆر بەکەمی وەك دیاردەیەکی سەربەخۆ سەرنجی دراوەتێ. ئارێنت هۆی

ئەمە دەباتەوە سەر ئەوە کە دیاردەی دەسەڵاتو قەهر بەیەك چاو سەیریان دەکرێ. بەڵام لە راستیدا دوو چەمکی بە تەواوی لێك جیاو تەنانەت دژبەیەکن. ئارێنت دەنووسێ: " کاتێك بەوردی سەیری ئەم هەمووە نووسینە دەکەین، کە لەبارەی دەسەڵاتدا نووسراون، مەسەلەی قەهر راست لەربەر ئەم هۆیە سەرنجی نادرێتێ. چونکە هەموو خاوەن راکان لە چەپەوە تا راست، لەوەدا هاودەنگن کە دەسەڵاتو قەهر یەك چەمکن. بە واتایەکی دی قەهر جگە لە بەرچاوترین نوێنگەی دەسەڵات شتێکی دیکە نیە" (٥)

هانا ئارێنت بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی، ئاماژە بە وتەیەکی " رایت میلز" خاوەن ڕای زانستە سیاسییەکان دەکا کە گوتوویەتی:" سیاسەت هەمووی هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و لووتکەی دەسەڵاتیش شتێك نیە جگە لە بەکارهێنانی قەهر." ئارێنت دەڵێ ئەم بۆچوونەی "میلز" لەراستیدا پەیڕەوی لە "ماکس ڤیبەر" و پێناسە بەناوبانگەکەی دەکا کە لە بارەی دەسەڵات دایە کە دەڵێ:" دەوڵەت واتە پێوەندیی دەسەڵاتی ئینسانەکان بەسەر ئینسانەکانی دیکەدا کە لەسەر ئامرازی مەشرووع ( یان بەرواڵەت مەشرووع ) ی قەهر دامەزراوە". ئارێنت دەڵێ، لە راستیدا ماکس ڤیبەریش لەم بوارەدا راست بۆچوونی ترۆتسکیی تەئیید کردوە کە لە وتووێژەکانی ئاشتیی برێست لیتۆفسکی دا گوتبووی:" هەر دەوڵەتێك لەسەر قەهر دامەزراوە".

لەراستییشدا ئەم وێکچوونە فکرییە لەبارەی قەهردا سەیرە، چونکە بەیەکزانینی دەسەڵاتی سیاسیو قەهرێك کە دەوڵەت رێکی دەخا تەنیا ئەو کاتە دەکرێ وای لێ تێ بگەی کە مرۆڤ وەك کارول مارکس پێی وابێ" دەوڵەت ئامرازی سەرکوتی چینی دەسەڵاتدارە". بەڵام بە بۆچوونی هانا ئارێنت سەیرتر لەوەش ئەوەیە کە ئەم وەك یەك تێگەیشتنە لەنێو زۆربەی خاوەن ڕایاندا کە مارکسیستیش نینو لە نێو ئەو کەسانەدا کە دەوڵەت بە تەنیا نیهادێکی رووبەنا نازانن، بەرچاو دەکەوێ. ئارێنت لەم بوارە دا ئاماژە بەهێندێك نموونەی سەرنجراکێش دەکا. بۆ نموونە "بێرتراند دوژڤونێل" شەڕ بە کردەویەك دەزانێ کە " پێوەندیی بە زاتی دەوڵەتەوە هەیە". ماکس ڤیبەر لەوەش هەورازتر دەچێو دەڵێ:" تایبەتمەندیی بەرچاوی دەوڵەت، بوونی پاوانی بەکارهێنانی قەهری مەشرووعی



فزیکییە". لێرەدایە کە هانا ئارێنت بە زیرەکییەوە دەپرسێ:" کەوابوو ئایا کۆتایی هاتنی شەڕی نیزامیی نێوان دەوڵەتان بە مانای کۆتایی هاتنی ئەم دەوڵەتانە نیە؟"(٦) جارێکی ڤۆڵتێر لە لەپێناسەی چەمکی دەسەڵات دا گوتبووی: " دەسەڵات یانی ناچارکردنی خەڵك بە ئەنجامدانی کارێك پێیخۆش نیە". ماکس ڤیبەریش ئەم پێناسەیەی بەم جۆرە تەواو کردبوو:" دەسەڵات یانی هەر دەرفەتێك کە لە چوارچێوەی پێوەندییەکی کۆمەڵایەتیدا بتوانێ سەرەڕای بەربەرکانیی کەسانی دیکە، بیسەپێنی". هەروەها ژۆڤونێل گوتبووی:" بەبێ ئەمرو ئیتاعەت، دەسەڵات مانای نیە". ئێستا بە رای هانا ئارێنت ئەگەر پێمان وابێ نێوەڕۆکی دەسەڵات لە کاریگەریی ئەمر دایە، بەپێی مەنتیق دەبێ وەك مائۆتسە دۆن بەو ئاکامە بگەین:" بەهێزترین دەسەڵات لە لوولەی چەکەوە دێتە دەر". لێرە دایە کە هانات ئارێنت ئەم پرسیارەمان دەخاتە بەردەم کە:" ئەدی چ جیاوازییەك لە نێوان ئەمری مەئموورێکی پۆلیس لەگەڵ چەتەیەکی چەکدار دا هەیە؟".

هانا ئارێنت پاش پێناسەو لێکدانەوە وێکچووەکان کە لەنێو زانایانی فەلسەفەی سیاسیدا لە بارەی چەمکەکانی دەسەڵاتو قەهرو زۆرو ئۆتۆریتەو... هتد دا باون، بەو ئاکامە دەگا:" وادیارە سەرەڕای ئاستی زانستی سیاسیی ئەمڕۆ، زمانی عیلمیی ئێمە کاری بە هەڵاواردنی چەمکە کلیلییەکانی نێوان " دەسەڵات"، " زۆر"، " هێز "، " ئۆتۆریتە "و " قەهر "دا، کە هەموویان دیاردەگەلی بەتەواوی لێك جیان، نیە".(٧) ئەوەی لەم بارەیەوە هانا ئارێنت رەخنەی لێ دەگرێ، ئەوەیە کە ئەم ناڕوونییە لە چەمکدا، تەنانەت لە بیرۆکە سیاسییەکانیشدا وەبەر چاو دەکەوێ. ئەگینا تێکەڵیی واتاو بەکارهێنانی ئەم چەمکانە لە جێی یەکتریدا، لە زمانی رۆژانە دا شتێکی سەیر نیە.

هانا ئارێنت پاشان دەست دەکا بە پۆلینبەندیو روونکردنەوەی وردی هەرکام لەم چەمکە کلیلیانە، لە روانگەی خۆیەوە:

" دەسەڵات" (macht) توانایەکی ئینسانییە، نەك بۆ ئەنجامدانی کارێك، بەڵکوو بۆ رێککەوتنی مرۆڤەکانو هەنگاوی هاوبەشیان. بەپێی ئەم پێناسەیە، قەت ناتوانی دەسەڵات بە هی کەسێك بزانی. چونکە دەسەڵات هەمیشە تایبەتمەندییەکی کۆمەڵایەتیی هەیەو

لەبەر دەستی کۆمەڵێك مرۆڤ دایە. مادام ئەو کۆمەڵە مرۆڤە یەکگرتوویە، دەسەڵاتەکە بەردەوامە. بۆ وێنە کاتێك دەڵێین فلان کەس بەدەسەڵاتە، بەو مانایەیە کە ئەو کەسە لەلایەن کۆمەڵێك کەسەوە، بەرپرسایەتیی پێ دراوە کە بەناوی ئەمان کارێك بکاو هەر بۆیە بەبێ پشتیوانیی ئەم کەسانە دەسەڵاتەکەی بێ مانایە. کەوابوو ئەگەر لە زمانی رۆژانەدا باسی کەس یان کەسایەتییەکی بە دەسەڵات دەکەین، مەبەستمان زیاتر کەسایەتییەکی بەتوانایە نەك کەسێکی خاوەن دەسەڵات. چونکە:

" زۆر"(Starke) بە پێچەوانەی دەسەڵات هەمیشە تایبەتمەندیی تاکەو دەکرێ لەگەڵ چۆنیەتییەکی لەم چەشنە لە ئەفراد یان شتێکی دیکەدا بەراورد بکرێ. زۆری کەسێك قەت ناتوانێ لەبەرامبەر دەسەڵاتی بەکۆمەڵدا خۆی رابگرێ.

" هێز "(Kraft) کە ئەغلەب لەگەڵ "زۆر" لێیان تێك دەچێ، بە بۆچوونی هانا ئارێنت تایبەت بە دیاردە سروشتییەکان ( هێزی سروشت ) ە.

هانا ئارێنت " ئۆتۆریتە" (Autoritat) لە رووی واتاوە بە دژوارترین واتا دەزانێو لەچاو چەمکەکانی دیکە ئەگەری خراپ کەڵك لێوەرگرتنی زیاترە. ئۆتۆریتە هەم دەتوانێ لە تایبەتمەندییەکانی تاك بێو هەم نیهادێك. بۆ نموونە ئۆتۆریتەی تەواو دەکرێ لە نێوان دایكو باوك لەگەڵ منداڵەکانیان، یان ماموستاو قوتابیدا بەدی بکرێ. ئۆتۆریتەی نیهادێك دەتوانێ لە شکۆمەندیی نیهادە ئایینییەکانی وەك کلیسای کاتولیك یان پێکهاتە میلیشیاکان دا بەدی بکەین.

تایبەتمەندیی بەرچاوی ئۆتۆریتە، بەرەسمی ناسینی بێ ئەم لاو ئەو لای کەسانێکە کە چاوەروانیی گوێڕایەڵیو پێڕەویی لێ کردنیان لێ دەکرێ. ئۆتۆریتە پێویستیی بە جەبرو رازی کردن نیە. بۆ وێنە ئەگەر باوکێك بە لێدان منداڵەکەی تەمبێ بکا، یان بۆ رازی کردنی تەنیا پەنا بۆ بەڵگە هێنانەوە بەرێ، لە هەردوو حاڵەتدا ئۆتۆریتەی بەکار نەهێناوە. رەفتاری باوکەکە لە حاڵەتی یەکەمدا دیکتاتۆرانەو لە حاڵەتی دووهەمدا دیموکراتیانەیە. هەردووکی ئەمە پێچەوانەی ئۆتۆریتەن. بە بۆچوونی ئارێنت وەدیهاتنو بەردەوامیی ئۆتۆریتە، پێویستیی بە رێزگرتنی بێ ئەم لاو ئەو لای



کەسێك یان نیهادێك هەیە. هەربۆیە ترسناکترین جۆری دوژمنایەتی لەگەڵ ئۆتۆریتە، موخالیفەت لەگەڵکردنی نیە بەڵکوو گوێپێنەدانو حیساب بۆ نەکردنیەتی.

سەرەنجام چەمکی "قەهر"(Sewalt) ە کە بە بۆچوونی هانا ئارێنت بەکارهێنانەکەی بەردەوام پێویستیی بە ئامراز هەیە. رەنگە نزیکترین چەمك لە "قەهر"، "زۆر" بێ. چونکە ئامرازەکانی بەکارهێنانی قەهر وەك ئامرازەکانی دیکە لەبەر دەستی مرۆڤ دان کە یارمەتی بە زیاد کردنی زۆر دەدەنو لە ئاکامدا ئامرازەکانی بەکارهێنانی قەهر، جگە لە ئامرازەکانی بەکارهێنانی زۆر شتێکی دیکە نین. بۆ نموونە، کەسێك دەتوانێ بە رەشاشی دەستیی خۆی خەڵکێکی زۆرلە بێدەنگی دا رابگرێ. ئەگەر لەجیاتی رەشاش چەکێکی وەك بۆمبی ناوکی ناوبەرین، بە هۆی ئەم چەکەوە دەتوانین میلیۆنان کەس بترسێنینو بە زمانی زۆر قسەیان لەگەڵ بکەینو بەم جۆرە "قەهر" بەکار بێنین. (٨)

هانا ئارێنت لەو نامەیەیدا باسیکرا، بەوردی لە بارەی چەمکەکانی دەسەڵاتو قەهرو جیاکردنەوەیان لە یەکتر، بیر دەکاتەوە. هەروەك گوترا لەلای زۆربەی خاوەن رایانی سیاسی بە شێوەیەکی سەیر تێکەڵاویی واتای دەسەڵاتو قەهر بەرچاو دەکەوێ. زۆربەیان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە قەهر جگە لە بەرچاوترین نوێنگەی دەسەڵات شتێکی دیکە نیە. بەڵام لە لای هانا ئارێنت ئەم دوو چەمکەدا، لە نێوەرۆکدا جیاوازن:" یەکێك لە چارەنووسسازترین جیاوازییەکانی دەسەڵاتو قەهر ئەوەیە کە دەسەڵات هەمیشە بەستراوەتەوە بە ژمارە، لە حاڵێکدا قەهر تا رادەیەکی دیاریکراو و بەستراوە بە ژمارە نیە، چونکە قەهر پشت ئەستوور بە ئامرازە."(٩)

ئارێنت دەڵێ بەمەبەستی روونتر بوونەوەی ئەم جیاوازییە ئەوەندە بەسە کە توندرۆیانەترین حاڵەتی هەرکام لەو دوو چەمکە بێنییە بەر چاوی خۆت: توندرۆیانەترین حاڵەتی دەسەڵات دەتوانین لەم رستەیەدا بێنینە بەرچاو:" هەموو کەس لە بەرامبەر یەك کەس دا"و تەندرۆیانەترین نوێنگەی قەهر دەتوانین لە رستەی " یەکێك لە بەرامبەر هەمواندا " بێنینە بەر چاو. ئەوەی دووهەم بەبێ ئامرازو کەرەسەی بەکارهێنان هیچ کات ناتوانێ ببێ. دیارە ئەم نموونەیە زیاتر لایەنی سەمبولیکیی هەیەو بۆخۆی بە روونی

جیاوازیی نێوەڕۆکی دەسەڵاتو قەهر نیشان نادا. هانا ئارێنت بە هەڵسەنگاندنی پێوەندیی نێوان " ئامانجو ئامراز" تیشك دەخاتە سەر ئەم ناڕوونییە:" قەهر خاوەنی تایبەتمەندیی ئامرازییە وەکوو هەر ئامرازو کەرەسەیەك، هەمیشە پێویستیی بە ئامانجێکە کە بە دوای خۆیدا بەرێو کەڵك لێوەرگرتنەکەی پاساو بدا. ئەو شتەی بۆ پاساودانی خۆی پێویستیی بە شتێکی دیکە هەیە، تایبەتمەندیی بەکارهێنانی هەیە، بەڵام هیچ کات چارەنووسساز نیە."(١٠)

لە دەقی ئەم قسەیەی سەرەوەڕا دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە ناکرێ بە هۆی دیاردەی قەهرەوە پەی بە ماهیەتی دەسەڵات ببەین. قەهر بە پێچەوانەی دەسەڵات، سروشتێکی وێرانکەری هەیە نەك بنیاتنەر. ئامانجێك کە بە هۆی قەهرەوە وەدی دێ، پێویستیی بە ئامرازێك هەیە کە تایبەتمەندیی رووخێنەر، ترس هێنەرو ملهوڕانەی هەیە. بەڵام ئەو شتە لەبارەی دەسەڵاتدا راست نیە. دەسەڵات تایبەتمەندیی فەردیی نیە، تەنیا ئەو کاتە پێك دێ کە مرۆڤەکان یەك بگرن. دەسەڵات هەمیشە پێویستیی بە کەشوهەوای ئاشتیخوازانەو متمانەبەیەکترکردن هەیە. لەحاڵێکدا کەشوهەوایەك کە بە هۆی قەهرەوە دەخولقێ، پڕە لە ترسو پەرێشانی و نەبوونی متمانە. هانا ئارێنت بە شێوەیەکی روون ئەم جیاوازیانە دەخاتەوە سەریەك:" لە قامووسی سیاسیدا هەر ئەوەندە بەس نیە بڵێین دەسەڵاتو قەهر یەك نین. دەسەڵاتو قەهر لە بەرامبەر یەکتردان. لە هەر جێیەك یەکێك لەم دووانە زاڵ بێ، ئەوی دیکە نیە. قەهر ئەو کاتە دەستی بۆ دەبرێ کە دەسەڵات لە مەترسی دابێ. ئەگەر چارەنووسی دەسەڵات بە قەهرەوە ببەستینەوە ئاکامی یەکجاری لە یەك کاتدا کۆتایی دەسەڵاتو لەنێو چوونیەتی. کەوابوو تەنانەت ناکرێ ئیددیعا بکەین کە خاڵی بەرامبەری قەهر نەبوونی تەندوتیژییە. دیارە باس لە دەسەڵاتی "بەبێ قەهر" ناتوانێ مانای هەبێ... قەهر دەتوانێ دەسەڵات لەنێو بەرێ، بەڵام قەت ناتوانێ پێکی بێنێ. شتێك لەلوولەی چەکەوە بێتە دەر دەتوانێ فەرمانێکی کاریگەر بێ کە ئیتاعەتێکی بێ ئەملاوئەولا دەخوازێ، بەڵام دەسەڵات لە لوولەی چەکەوە نایەتە دەر."(١١)



بەسەرنجدان بەو بۆچوونانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین دەسەڵات لە ئەندێشەی سیاسیی هانا ئارێنت دا سروشتێکی کۆمەڵایەتیی هەیەو لە یەکگرتنی خۆبەخشانەی هێزە ئینسانییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. توخمە پێکهێنەرەکانی دەسەڵات، خەڵكو ئیرادەی هاوبەشیانە. تاكو تەنانەت گرووپێکی سەرنەکەوتوو و پەرش‌وبڵاویش، خاوەنی دەسەڵات نین. چونکە سەرچاوەی پێکهاتنو گەشەکردنی دەسەڵات، بریتییە لە پێوەندیو هاموشۆی ئازادانەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکترو یەکدەنگیو هەنگاوی هاوبەشیان. جگە لەوەش هانا ئارێنت یەکێك لە پێویستترین لایەنەکانی دەسەڵات، واتە مەشرووعیەت شیدەکاتەوەو دەنووسێ:" دەسەڵات پێویستیی بە پاساودانی خۆی نیە. چونکە شتێکی تایبەت بەخۆ ( فی نفسە)یە و لە زاتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا هەیە، بەڵام دەسەڵات پێویستیی بە مەشروعیەتە، بەڵام مەشروعیەتی دەسەڵات لەسەر بنەمای ئەو ئامانجو کەرەسانە کە گرووپێکی کۆمەڵایەتی بەکاریان دێنێ، دانەمەزراوە، بەڵکوو لە سەرچاوەی دەسەڵاتەوە کە دامەزرانی گرووپ پێکی دێنێ، سەرچاوە دەگرێ. دەسەڵات بۆ مەشرووعیەتدان بە خۆی پەنا دەباتە بەر رابردوو. لە حاڵێکدا ئامانجێك کە پاساودەری ئامرازە، شتێکە کە پێوەندیی بە داهاتووەوە هەیە. دەکرێ قەهر پاساو بدەین ، بەڵام هیچ کات ناکرێ مەشرووعیەتی پێ بدەین. (١٢)

هانا ئارێنت لەبەشێکی دیکەی نامەکەی خۆیدا باس " لە خۆبێگانە بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتی" دەکا. بە بۆچوونی وی، ئەو شتە کاتێك روو دەدا کە دەوڵەتی قانوونی، وەکوو نیهادی بەڕێوبردنی ئیرادەی خەڵك، لەڕێی سەرەکیی ئەرکی خۆیدا بەلاڕێدا بچێو کاربەدەستان بۆ پارستنی دەسەڵاتی بێ پشتیوانیان وردە وردە قەهر لەجێی دەسەڵات دادەنێن. ئارێنت دەڵێ:" ئەو شتەی دەسەڵات دەداتە نیهادو قانوونەکانی وڵاتێك، پشتیوانیی خەڵکە کە لەراستیدا بۆخۆشی درێژەی ئەو پەیمانە سەرەتاییەیە کە ئەم نیهادو قانوونانەی پێك هێناوە. لە دەوڵەتێکی قانوونیو نوێنەرایەتیی پارلمانیدا، خەڵك دەسەڵاتداری ئەسڵینو بەسەر ئەو کەسانە دا زاڵن کە حکوومەتیان بەدەستە. تەواوی نیهادە سیاسییەکان کە نوێنگەی دەرکەوتنی دەسەڵاتن، هەرکە پشتیوانیی کۆمەڵانی خەڵکیان لە دەست دا، بەرەو چەقبەستوویيو هەڵوەشان دەچن."(١٣)

بەواتایەکی دیکە کاتێك نیهادێکی بەڕێوەبەری، جا چ ڕێبەری حیزبێك بێو چ حکوومەتێك، ئیدی لەلایەن هەڵبژێنەرانی خۆیەوە متمانەی پێ نەکرێو پشتیوانیی لێ نەکرێ، بە شێوەیەکی قانوونی دەسەڵاتی خۆی لەدەست دەدا. ئەو دەسەڵاتە لەدەست چووە، بە هیچ هۆیەکی دیکە قەرەبوو ناکرێتەوە، مەگەر لەرێگەی گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ سەرچاوەی ئەسڵیی خۆی واتە خەڵكو وەدەستهێنانەوەی متمانەی ئەوان. ئەمەش لەراستیدا بنەمای سەرەکیی هەموو سیستەمە دیموکراتیکەکانە: بووژاندنەوەی سەرلەنوێی دەسەڵات لە رێگەی هەڵبژاردنو دەنگی خەڵکەوە. ئێستا بە بۆچوونی هانا ئارێنت ئەگەر حکوومەت ئەم کارە وەپشت گوێ بخا، ناچارە بۆ پاراستنی جێگەی خۆی پەنا بەرێتە بەر ئامرازێکی دیکە و لە راستی دا قەهر لەجێی دەسەڵاتی لە دەستچوو دابنێ. ئەگەر شتێکی ئەوتۆ روو بدا، یەکەم هەنگاو بۆ لەنێو بردنی دەسەڵات بە یەکجاری، هەڵ دەگیرێ. هەنگاوەکانی دواتر واتە سنووردارکردنی ئازادی، راوەدوونانی جیابیرانو نەهێشتنی ژیانی ئاشتیخوازانەی کۆمەڵایەتی حەتمەن بەدوای هەنگاوی یەکەمدا هەڵ دەگیرێن. بەم جۆرە تەواوی کۆمەڵگە دەکەوێتە گێژاوی قەیرانێکی قووڵو شەڕی تەواو عەیاری قەهر لەدژی دەسەڵاتو بێنێوەڕۆك کردنو مایەپووچ کردنی بە تەواویی نیهادەکانی دەسەڵات دەست پێ دەکا. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا بە وتەی هانا ئارێنت:" دەکرێ قەهر لەجێی دەسەڵات دابنرێو تەنانەت سەرکەوتنێکی کاتییشی لەگەڵ بێ، بەڵام نرخێك کە دەبێ بۆ ئەم سەرکەوتنە بدرێ، یەکجار زۆر گرانە. چونکە لەم حاڵەتەدا نەك هەر خەڵك نرخێکی گرانی بۆ دەدەن، بەڵکوو حاکمانیش ئەم نرخەی لە دەسمایە مەعنەوییەکانی دەسەڵاتی خۆیان دەدەن و لە راستی دا هەردوو لا دۆڕاون... ئەوەی لە نیهادی دەسەڵات دەمێنێتەوە، شتێك نیە جگە لە ئامرازی بەکارهێنانی توندوتیژی." (١٤)

کاتێك باشتر لەم وردبینیەی هانا ئارێنت لە بارەی " لەخۆ بێگانە بوونی دەسەڵات" دەگەین کە چاوێك بە ئەزموونی شۆرشی ١٩٧٩ی وڵاتی خۆمان ( ئێران) دا بخشێنین: ئەو دەسەڵاتەی لە جەرگەی شۆرش هەڵقوڵاو لە سەرەتادا لەلایەن چینو توێژەکانی کۆمەڵایەتییەوە پشتیوانییەکی بەرینی لێدەکرا، بەپێی چەمکی "ئارێنتی" خاوەنی دەسەڵاتی



واقعی بوو، بە تێپەڕینی کات بە مەبەستی لەپاواننانی دەسەڵاتی خۆی، وردە وردە قەهرێکی رێکخراوی لە جێی دەسەڵاتی واقعی داناو سەرەنجام کار گیشتە بەربەرەکانی لە دژی خەڵك واتە سەرچاوەی سەرەکیی دەسەڵات. ئەمڕۆ بە مایەپووچ بوونی هەموو نیهادەکانی دەسەڵات لە ئێراندا، شتێك جگە لە ئامرازی تۆقاندن، سەرکوتو فریودانی خەڵك لەم نیهادانە نەماوەتەوە. ئەم نیهادانەی لە دەسەڵاتی واقعی کە لەلایەن خەڵکەوە پشتیوانیی لێ بکرێ، بێبەشن. هەروەك بڵێی سەبارەت بەمەیە هانا ئارێنت دەڵێ: " توخمی رووخێنەری سەرکەوتنی قەهر بەسەر دەسەڵاتدا، لە هیچ جێگەیەکدا بە روونیی هەرێمی ژێر فەرمانی حکوومەتی تێرۆر خۆی نانوێنێ. دیارە تێرۆر قەهر نیە، چونکە حکوومەتی تێرۆر کاتێك جێی حکوومەتی قەهر دەگرێتەوە کە دووەمینیان ( قەهر ) پاش لەنێو بردنی تەواوی نیهادەکانی دەسەڵات، دەست هەڵناگرێ، بەڵکوو بەپێچەوانەوە کۆنترۆڵی ناوەندی دەزگای دەوڵەتی دەگرێتە دەست." (١٥) بەم جۆرە بە بۆچوونی هانا ئارێنت هیچ کات دەوڵەتێك نەبووە کە بتوانێ بە تەواویو تەنیا پشت ئەستوور بە ئامرازی قەهر بێ. چونکە تەنانەت حکوومەتە پاوانخواز( توتالیتەر )ەکانیش کە گرنگترین ئامرازی حکوومەت کردنیان زیندان، تێرۆری پۆلیسیو ئەشکەنجەیە، پێویستیان بە بنەمایەکی دەسەڵاتە کە لە وەزعێکی وادا لە پۆلیسی نهێنیو بەکرێگیراوانو جاسووس پێك دێ.

هانا ئارێنت پێی وایە ژیانی مرۆڤ بە رادەیەکی یەکجار زۆر لە ژێر کاریگەریی رووداوە سیاسییەکاندایە کە دەسەڵاتی سیاسی لە ناوەندی هەمووان دایە. بۆیە هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتی سیاسی، تەوەرەی سەرەکیی لێکۆڵینەوەی هانا ئارێنت پێك دێنێ. بە باوەڕی وی، دەسەڵاتی سیاسی دیاردەیەکە کە لە مرۆڤەکانو پێوەندیی ئازادانەو خۆبەخشانەی ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێ. مادام کە بەرهەمی راستەوخۆی ئیرادەی خەڵکە، زیندووو لەسەر پێیە. بەڵام هەرکات ئەم دەسەڵاتە بوو بە گەپچاڕی دەستی تاقمێکی ملهوڕ، بەرەو مایەپووچیو لێکهەڵوەشان دەچێ. هانا ئارێنت وەك زانایەکی ئازادیخوازو مرۆڤدۆست، لە هەموو بەرهەمە بەنرخو نەمرەکانیدا، بانگەوازی دەسەڵاتو ئارامیو دژایەتیی قەهرو پاوانخوازی دەکا.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


١) totalen Herrschaft Elemente und Ursprunge der

٢) Wahrheit und luge in der Politik

٣)Revolution Uder die

٤) Macht und Gewalt

٥) Hannah Arendt, Macht und Gewalt, Munchen

٣٦S. ١٩٨٧

٦) ٣٧H. Arendt,a.a.O.,S

٧) ٤٤H.Arendt, a.a.O.,S

٨) ٤٧,٤٥ H.Arendt,a.a.O.,S.

٩) ٥٠H. Arendt, a.a.O.,S.

١٠) ٥٢a.a.O., S. H. Arendt

١١) ٥٤H.Arendt, a.a. O.,S.

١٢) ٥٣H.Arendt, a.a..O.,S.

١٣) ٥٧) H. Arendt, a.a. O., S.

١٤) ٥٥H. Arendt, a.a.O.,S.

١٥) ٥١ Arendt, a.a. O.,S. .H




# دیموکراسیی هابزی

**ن: فرانك فان دان**

دێموکراسییە مۆدێرنەکانی رۆژئاوا دەتوانین بە دێموکراسیی هابزی ناو بەرین. ئەمانە ئەم پرەنسیپەیان کردۆتە بناخە بۆ خۆیان کە حکوومەت سەبارەت بە هەموو ئامانجە کردەیی‌و باشەکانی خۆی بریتییە لە دەسەڵاتی سیاسی لە جۆری هابزی. هەرچەندە تایبەتمەندییەکەیان ئەوەیە زۆربەی ئەوانەی دەسەڵاتی موتڵەقی حکوومەتیان پێ دەسپێردرێ ، بە دەنگی نهێنی‌و بە پێی رێوشوێنی گشتیی دەنگدان هەڵ دەبژێردرێن.

وێنستۆن چێرچیل جارێکی گوتبووی" دێموکراسی خراپترین شێوەی حکوومەتە، دیارە جگە لە هەموو شێوەکانی دیکەی حکوومەت " هەروەك دەی بینین ئەو بۆچوونە لە بارەی دێموکراسیی هابزیدا راست نیە. لە راستیدا بۆ ئەم قسەیە کە دێموکراسیی هابزی لە ریزی خراپترین شێوەکانی حکوومەتە دەکرێ هۆی حاشا هەڵنەگر هەبێ . بە تایبەتی لە بەر ئەوە کە ئەم حکوومەتە لە لایەن کەسانێکەوە لە سیاسەتدا ئەرکێکیان لە سەر شانەو نامەسئوولییەتی لە نێو مرۆڤەکان دا نیهادینە دەکەن کە دیارە ئاکامەکەی جێی نیگەرانییە.

شکڵی هابزیی دێموکراسی بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەکە رۆژئاوای گرتۆتەوەو ئێستاش لە لایەن زۆربەی خەڵکەوە وەك نموونەی بەرزی مەشرووعیەتی سیاسی سەیری دەکرێ، ئەویش سەرەرای ئەم راستییە کە مێژووەکەی پرە لە قەیرانە دووپات بووەوەکان. دیارە دەکرێ بە ئاماژە کردن بە رۆڵی هەڵبژاردن ، رەخنە لە مەرجی نامەسئوولییەتی بگیرێ ئەو نامەسئوولییەتەی ئەغلەب وەك دیارخەری دەوڵەتی مەسئولو هەڵبژێراو سەیری دەکرێ. هەر چەند ئەم رەخنەیەش قورساییەکی ئەوتۆی نیە. تەنیا تەکنیکێکە کە لە ژێر قانووندا ماناو

گرنگیی خۆی وەدەست دێنێ کە لەودا جێی خۆی کردۆتەوە. دەنگدان لە پێشبڕکێی شاژنی جوانی شتێکەو دەنگدان لە پێشبڕکێی دەسەلاتی سیاسیدا شتێکی دی. کەوابوو لە زەمینەیەکی ئەوتۆدایە دەبێ بناخەی بۆچوونی خۆمان لە بارەی سەرکەوتن یان ناکامیی هەڵبژاردن لە دێموکراسیی هابزیدا هەڵ سەنگێنین. رۆڵو کاریگەریی هەڵبژاردن دیارە لە رژێمەکانی دیکەدا پێوەندییەکی ئەوتۆی بە باسەکەی ئێمەوە نیە.

## پێناسە

دێموکراسیی هابزی کۆمەلگەیەکە لە رووی سیاسییەوە رێك خراوە، حکوومەتێکە سنووری نێوان حکوومەتو ناحکوومەتیی بە روونی دیاری کردوە . تایبەتمەندییە سەرەکییەکەی بریتییە لە جێگەو پۆستی دەسەلاتدارەتیی موتلەق، کە ئەو کەسەی ئەو پۆستە بە ئەستۆوە دەگرێ لە لایەن بەشێکی بەرچاوی خەلکەوە هەڵ بژێردراوە. لە رووی قانوونییشەوە دەسەلاتو ئیزنی دانانی هەر چەشنە قانوونو رێوشوێنێکی هەیە کە خەلك بۆ بەرێوەبردنیان بریاریان لە سەر داوە. بە شێوەیەکی ئاسایی، ئەم بریارانە دەبێ لە هاوئاهەنگی لەگەڵ رێوشوێنێکی دیاریکراودا بدرێن ــ بەلام ئەم مەرجە لە هەموو رێکخستنە ئالۆزەکاندا هاوبەشەو بە هیچ جۆر تەنیا بە بەژنی دێموکراسیی هابزی نەبراوە.

ئەو رێوشوێنە بریاردانانەی بریارەکانی دەسەلات دیاری دەکەنو ئەو رێوشوێنە هەڵبژاردنانەی ژمارەو پێکهاتەو چالاکیی کاندیداکانی هەڵبژاردن دیاری دەکەن دەکرێ لە دێموکراسیی هابزییەوە بۆ دێموکراسییەکی دیکە بگۆردرێ. زۆر جار پێرەوی نێوخۆیی دێموکراسییە هابزییەکان روونی دەکاتەوە خەلك دەبێ تەنیا ئەندامانی لقی قانوون دانان هەڵ بژێرن. بەلام هێندێك پێرەوی نێوخۆی دیکە باس لە هەڵبژاردنی لقی بەرێوەبردن دەکەن. ( زۆر جار تەنیا هەڵبژاردن بۆ دیاریکردنی بەرزترین کەس یان سەرکۆمار نەك کار بەدەستانی دیکە)

جێگەو مەکانی دەسەلات لە دێموکراسیی هابزیدا لەو شکلەیدا ئێستا زالە بە دەزگای کەم یان زۆر ئالۆزی دەولەت بە رێگە چارەی فەرمیی " جیابی دەسەلاتەکان" دەسپێرێ ــ دابەشکردنی



دەسەلاتەقانوونیو حقووقییەکانی حکوومەت لە نێوان لقەکانی قانووندانان، بەرێوە بردنو سیستەمی دادپەروەریو ئیداریدا. بەبوونی ئالوگۆری جۆراوجۆرو ئستیسنای مومکین (لەم جۆرە دێموکراسی-یانەدا)، رێوشوێنێکی لەم چەشنە هەیە کە بەر بە هەرکەسێك دەگرێ لە یەك کاتدا پۆستێك زیاتر لە یەکێك لە لقە رێکخستنەکانی حکوومەتدا بگرێ. ئەوەی دێموکراسییەك دەکاتە جۆری هابزییەکەی ، بوونی دەسەلاتی موتلەقی دەسەلاتدار ( Sovereign Power )ە، ئەم مەرجەی کاربەدەستو بەرپرسانی فەرمیی رێبەرایەتی دەبێ لە رێگەی هەلبژاردنەوە دیاری کراین. ــ لانی کەمو زیاتر لە هەمووان ئەو پۆستانەی جێگەیەك دەگرن کە دەسەلاتی قانوون دانانیان هەیە...

## دووره دیمەنی هابزی

بەر لەوەی درێژە بە هەلسەنگاندنی رۆلی هەلبژاردن لە دێموکراسیی هابزی دا بدەین، بە جێیە هێندێك لایەنی تایبەتیی روانگەی هابز لە بارەی حکوومەتدا وەبیر بێنینەوە، بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە تێگەیشتن لە حکوومەتی دێموکراتیکەوە هەیە. بە پێی بۆچوونی تۆماس هابز، هەر مرۆڤێك خاوەنی مافی سروشتی لە بەرامبەر هەر شتێك دایە کە پێی وایە بۆ پاراستنی گیانی خۆی پێویستە، هەر چەند هابز خێراو بە زۆری ئەو ئەندێشەیە دەسەپێنێ کە "پاراستن" مەرجێکی سنووردارە. مافی سروشتیی مرۆڤ لە کردەوەدا مافێکە بۆ هەر شتێك مرۆڤ بتوانێ بیخاتە ژێر کۆنترۆلی خۆیەوە. هەر وەك ئاشکرایە، ئەگەر بێتو هەر مرۆڤێك هەوڵ بدا مافەکانی خۆی لە سەر هەر شتێك بەرێوەبەرێ ( کە دیارە ئەو شتە هەر مرۆڤێکی دیکەش دەگرێتەوە) کەوابوو هەر مرۆڤێك بە ناچار لە کێشەیەکی واقعی یان "بالقوە" دا لەگەڵ مرۆڤێکی دیکە لە شەڕ دایە. جگە لەوەش هەرکەس دەزانێ یان زوو بۆی دەردەکەوێ هێرشێکی پێشپێگرانە باشترین بەرگرییە. کەوابوو بە پێی بۆچوونی هابز، پێویستیی پاراستنی گیان بریتییە لە دەستدرێژی( aggression ) کردن. ئەمە ئاکامەکەی بریتییە لە شەڕی هەموو کەس لە دژی هەموو کەس . واتە هەمان " هەلومەرجی سروشتیی مرۆڤ ". کەوابوو ژیان شتێکی ناخۆش ، حەیوانیو کورتە. کە وابوو ئەوە فەرمانی عەقڵە هەر مرۆڤێك نابێ مافی خۆی لە سەر هەر شتێکی دیکە وەدی بێنێ. با روونتر بڵێین، نابێ زیاتر لە کەسێك هەبێ ئەو مافە بەرێوە بەرێ. بەلام بە سەرنجدان بە سروشتی مرۆڤ و ئەم راستییە هەر مرۆڤێك

دەروونی پڕە لە ئارەزوو بۆ دەسەڵات کە تەنیا بە مردن کۆتایی دێ، نابێ پێمان وابێ کەسێك دەست لە مافی خۆی هەڵبگرێ کە بریتییە لە بەجێهێنانی هەر شتێك کە پێی خۆشە. لانی کەم نابێ چاوەڕوانیمان لە مرۆڤێك هەبێ کارێکی وا بکا مەگەر بزانێ ئەو شتە بە قازانجی نیە. چونکە رەقەبەرەکانیشی راست هەر ئەو شتە دەکەن.

هەر چۆنێك بێ لە شەڕی هەموو کەس لە دژی هەموو کەس دا ، "خۆ چەك کردن"ی هەمە لایەنە، نەزانییە. چونکە کردەوەیەکی پێچەوانەی عەقڵەو یەکسانە بەوەی کە مرۆڤ سووكو ئاسان خۆی بکاتە نێچرێکی بێ دیفاع لە بەرامبەر رقەبەرەکانیدا. هەرچەند ئەوەش نەزانییە بە چەك کران رازی بین مەگەر ئەوە کە دوایین کەس بین چەکی خۆمان دانێین. هەر بۆیە رازی بوونێکی ئەوتۆ روو نادا. چونکە ئەگەر هەر کەسێکی ئاقڵ لە چاوەڕوانیی ئەنجام دانی هەمان کردەوە دابێ دوای خەڵکی دیکە، کێ ئامادەیە هەنگاوی یەکەم باوێ؟ کەوابوو تاقە ئاکامێك کە ئارەزووی بکەی ئەوەیە کەسێك ئەوەندەی دەسەڵات هەبێ کە بتوانێ خەڵکی دیکە ناچار بکا چەك بن . لەم کاتەدا، مرۆڤ دەتوانێ بە دڵنیایی تەواو لە مافی خۆی ، چاو لەو مافەی بپۆشێ کە دەتوانێ چی پێخۆشە بیکا. چونکە جگە لە رێبەرێکی بە دەسەڵات، هیچ کەسی دیکە لە وەزعێکی وا دا نیە ئیمتیازێك لە بڕیاری یەکی دیکە بۆ چەك بوون وەربگرێ . ئەو رێبەرە بەدەسەڵاتە کە لە دەسەڵاتی خۆی رادەبینێ ، دەزانێ کە دەتوانێ ئیرادەی خۆی بە سەر خەڵکی دیکەو رەزامەندیی خۆی بەسەر بێدەسەڵات وتێك شکاوەکاندا بسەپێنێ تاکوو ئەگەر پێڕەویان لێ کردو لە خزمەتی دابوون, ئیزنی درێژەدان بە ژیانیان پێ بدا. هەر بۆیە لە حاڵێکدا ئەو رێبەرە بە دەسەڵاتە درێژە بە بەرێوەبردنی مافی خۆی دەدا لەسەر هەر شتێکی پێی خۆشە ، هەموو کەسەکانی دیکە چاوپۆشی لە مافی خۆیان بۆ هەمان کار دەکەن. چونکە ئەوانە دەزانن یان دەترسن لەوەی نەتوانن دەرەقەتی رێبەری دەسەڵاتدار بێن. بە کورتی عەقڵ فەرمان دەدا مرۆڤ بێ ئەم لاو ئەولا لە بەرامبەر بەهێزترین دەسەڵاتخوازی مەیداندا مل دادەنوێنێ، جا هەر کەس بێ گرنگ نیە.

ئەگەر رێبەرێکی بە دەسەڵات هەبێ ، ئەوانەی ئاقڵن خێرا پێڕەویی لێ دەکەن. لە ئاکامدا هەرچی ئەو بڵێ ، دەیکەن. مرۆڤێکی ئاقڵ کە نەزانیی لێ ناوەشێتەوە، تەنیا لە بەر ئەو هۆیە کە



بە هێزەکان بەهێزن، بێ هیچ مەرجێك پشتیوانیان لێ دەکا. لە بەرامبەر دەسەڵاتی بەهێزتردا ، ترسنۆکی بۆخۆی بە ئاقڵمەندی دەژمێردرێ . جگە لەوەش ، هابز رەنگە ( لەم بارەیەوە) ئیلهامی لە رەواقیوونی یونانی کۆن وەرگرتبێ، ترسنۆکی بۆ خۆی لە دەسەڵاتی سەمبولێکدا شکڵی دەگۆڕێ . لە ڕاستیدا تەسلیمو سەردانواندنی بێ ئەم لاو ئەولای مرۆڤە گوناهبارەکان بەرابەرە لە گەڵ راگەیاندنی ئەوەکە ئەوانە لە لایەنی سەرکەوتوویان دەوێ هەرچی پێی خۆشە بیکا. لە ئاکامدا بە ئەنجامدانی ئەوەشتەی رێبەری بەدەسەڵات بۆ خۆی پێی خۆشە، ئەو سەرکەوتوە وەڵامی ویستی لایەنی شکاوی داوەتەوە. وەك بڵێی بە هۆی سێحرو جادوو، ملکەچیی مرۆڤی ترسنۆك دەبێتە فەرمانێك بۆ رێبەری بەدەسەڵات کە جگە لە بە جێ گەیاندنی کارێکی دیکەی لە دەست نایە.

لە خودی قسەکانی هابز دا، ئەوانەی مل بۆ فەرمانی رێبەرێکی سەرەڕۆ رادەکێشن، ئیزنی ئەوەی پێ دەدەن هەرچی پێی خۆش بێ بیکا. لە ئاکامدا ئەوان بۆخۆیان دەبنە هۆی کردەوەکانی وی. کەوابوو هەرچی ئەو دەیکا لە راستیدا بە نوێنەرایەتیی ئەوانە دەیکا. ئەو رێبەرە سەرەڕۆیە دەبێتە "ئەنجامدەری هەڵبژێردراو " لە لایەن ئەوانەوە. بە کورتی تەسلیم بوونی بێئەم لاوئەولای ئەوان پێوەندییەکانی نێوان رێبەری سەرەڕۆو ئەوانەی پێڕەویی لێ دەکەن دەکاتە پێوەندیی نێوان ئەنجامدەرێك وئەو خەڵکەی ئەویان کردۆتە وەکیلی خۆیان . لە ئاکامدا هەرچی ئەو رێبەرە سەرەڕۆیە بیکا بە بێعەدالەتی دەرهەق بە هیچکام لە پێڕەوەکانی ناژمێردرێ. چونکە لە رووی قانوونیو مافەوە ئەوان بۆ خۆیان هۆی کردەوەکانی ئەون.

حکوومەت لە لایەنی سیاسییەکەیەوە بیرۆکەی دەسەڵاتی بەهێزتر بەسەر لاوازترمان لە لا دروست دەکا. بەڵام لە لایەنی مافەوە بیرۆکەی دەسەڵاتی تاكو وەکیلایەتیی لاوازەکانمان لە رێگەی دەسەڵاتی سیاسییەوە لە لا دروست دەکا، واتە کەسێك کە لە رووی مافوقانوونەوە نوێنەر یان "هەڵبژێردراو" ی ئەوانە. دیارە ئەوە ئیستیدلالێکی زیرەکانەو رازاوە بوو. هەروەك پاسکاڵ لەم بارەیەوە گوتوویەتی:"ئەمانە لە حاڵێکدا ناتوانن دادپەروەری جێگیر بکەن، پاساو بۆ دەسەڵات دێننەوە، بەڵام دەبێ دەسەڵات و دادپەروەری یەك بگرنودەبێ ئاشتی سەقامگرتوو بێ، ئاشتییەك کە چاکەیەکی موتڵەقە."

بەرچاوترین لایەنی تیئۆریی هابز تەئییدی رووهەڵماڵاوانەی ( بەکارهێنانی ) ماف لە بارەی هەر شتێکدا وەك "مافی سروشتی"ی مرۆڤی بوو . مانای ئەمە ئەوەیە کە هەر کەس

بە گوێرەی سروشت خاوەنی مافی بێئەم لاو ئەو لای ئاغایەتی بە سەر جیهان دایە، ئەگەر بتوانێ بەسەر بەربەرەکانیی خەڵکدا سەرکەوێ. هابز بە کەڵك وەرگرتن لە ئیستیدلالی رەواقیوون بۆ مەبەستی خۆی، لە دارِشتنی بیرۆکەیەکدا سەرکەوت کە لەودا هەر کەس دەتوانێ بەو جێگەیە بگا کە باسی کرا. رێبەری سەرەڕۆ بە کردەوە بە وەلانان یان زاڵبوون بەسەر موخالیف یان رقەبەرەکانیدا یان ئەوانەی لەوانەیە ببنە رقەبەر، بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ یان بە نوێنەرایەتی لەرووی قانوونییەوە ئەم کارەی دەکا...

## گۆڕینی رێگە بەرەو دیموکراسیی هابزی

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە ولە سەدەی بیستدا ئایدیۆلۆژییە دیموکراتییەکان عەلاقەیان بە ئیستیدلالەکانی هابز نیشان دا. لە لێکدانەوەی ئەمانەدا، ئیدی حکوومەت نەك ئاڵتەرناتیڤێك بۆ شەڕی هەموو کەس لە دژی هەموو کەس بوو، بەڵکوو تەنیا وێنەیەك لە چۆنیەتیی ئەو بوو. شەڕی هەموو کەس لە دژی هەموو کەس دەبووا لە شێوەی پێشبڕکێی هەڵبژاردنو شەڕی هەڵ بژێنەرەکاندا روو بدا.

لە شەڕی دیموکراتیکیی هەموو کەس لە دژی هەموو کەسدا ئەو بەشانەی دانراون زۆر گەورەن، چونکە "سەرکەوتوو" هەمووان دەکاتە ملکی خۆی. ئەو پاڵ وە دەسەڵاتی موتلەقی قانووندانان دەدا. هەر بۆیە دەچێتە نێو بارودۆخێکەوەو لە رێگەی ئەمەوە دەتوانێ ویستو ئیرادەی خۆی بە سەر هەر کەسێك لە هەرێمی حکوومەتی وی دابێ، بسەپێنێ. دیارە تا ئەو کاتەی لە رێوشوێنێکی دیکەی شەڕی هەموو کەس لە دژی هەموو کەسدا شکستی نەخواردبێ.

لەو لێکدانەوە دیموکراتیکییەدا، مافی سروشتیی هابزی لە بارەی هەر شتێکدا تاك بیەوێ دەتوانێ بیکاتە هی خۆی، دەبێتە مافی هاووڵاتی بۆ هەر مرۆڤێك کە بتوانێ بە شێوەی سیاسیو لە رێگەی مافەوە وەدەستی بێنێ. مافی هەر مرۆڤێك کە دەتوانێ هەر مافێکی لەسەر هەر شتێکی هەیەتی بیکا، دەبێتە مافی هاووڵات بۆ ئەنجامدانی هەر کردەوەیەك لە رێورەسمی دەنگداندا دەتوانی بیکا. تەنیا ئەگەرەکانو ناخۆشییەکانی شەڕ بە لایەکداو سیاسەتەکانی پێوەندیدار بە هەڵبژاردنەوە بەلایەکی دیکە دیاری دەکا کێ ئێستا دەسەڵاتدارە لە دانانی هەر قانوونێکدا کە پێی خۆشە. سەلاحیەتی قانوونیی حکوومەتێکی دیموکراتیك بۆ



هەموو مەبەستەکردەییەکانی کەمتر لەو حاکمیەتە نیە هابز باسی دەکا. بە گوێرەی شێوەی قانوونەکانی سەردەم، رادەی سەلاحیەتەکەشی دەتوانێ بگۆڕێن. بەڵام مێژوو نیشانی داوە لە ژێر دەسەڵاتی رێژیمە دیموکراتیکەکاندا سنوورە قانوونییەکان بۆ دەسەڵاتی حکوومەت زەمینەی ئەوەیان هەیە هەڵ بگیرێن، تەنانەت لە رێژیمە فیدراڵەکانیشدا. دوور روانینی دەستوور کە بە رواڵەت بواری ژیان یان سنووری دارایی بۆ خەڵك دەستەبەر دەکاو حکوومەت ناتوانێ دەستیان تێوەر بداو زیاتر سەمبولیکە بە ئاسانی دەکرێ بگۆڕێن. دادگاکان کە لە ریزی ئۆرگانە حکوومەتییەکان دان ئەوقانوونانە بەرێوە دەبەن کە لە لایەن دەسەڵاتی قانوون دانانەوە دانراونو دەوڵەت وەزارەتخانەکانو ناوەندە حکوومەتییەکانی دیکە بەرێوەیان دەبەن. هیچ کام لەو هێزانە ئیدی سەر بە دەسەڵاتی قانوون دانان نین. چونکە قانوونی بوونی هەموویان تا ئەو کاتەی قانوونە مەشرووعەکان بەکار دێنن لە رەخنەی گشتی پارێزراون. لە چەمکێکی ئەوتۆدا کە تەنیا چەمکێکی گونجاوە لە روانگەی خەڵکی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتەوە، ئەوانەی دەسەڵاتی قانوون دانانیان بەدەستە، سروشتییە کە هێزەکانی دیکەیان لە بەر دەست دایە.

ئاشکرایە تیڕوانینەکانی دەستووری ئایینده کە ئەوە دیاری دەکا چۆن دەسەڵاتی موتلەقی حکوومەت دەبێ رێکوپێك بکرێ وبەرێوەببرێ بەگشتی تا رادەیەك کەڵکی هەیە. هۆیەکەی ئەوەیە ئەمانە دەسەڵاتی رێکخستنی سیاسەتمەداران، بەرێوەبەرانو بەرپرسانی دادپەروەری دیاری دەکەن، واتە ئەو کەسانەی دەکرێ چاوەڕوانیمان لێیان هەبێ لە بەرامبەر ئەو هەوڵانەدا بۆ گۆڕینی هاوکێشەکان دەدرێن بەرگری لە دەسەڵاتی خۆیان بکەن.

دەسەڵاتێکی واقعی لە دەوڵەتێکی دیموکراتیکی ئەمڕۆدا لەچاو دەسەڵاتی واقعیی تەنانەت بەهێزترین شای سەرەرۆش لە ئاشکرایە تیڕوانینەکانی دەستووری ئایینده کە ئەوە دیاری دەکا چۆن دەسەڵاتی موتلەقی حکوومەت دەبێ رێکوپێك بکرێ وبەرێوەببرێ بەگشتی تا رادەیەك کەڵکی هەیە. هۆیەکەی ئەوەیە ئەمانە دەسەڵاتی رێکخستنی سیاسەتمەداران، بەرێوەبەرانو بەرپرسانی دادپەروەری دیاری دەکەن، واتە ئەو کەسانەی دەکرێ چاوەڕوانیمان لێیان هەبێ لە بەرامبەر ئەو هەوڵانەدا بۆ گۆڕینی هاوکێشەکان دەدرێن بەرگری لە دەسەڵاتی خۆیان بکەن.

مێژووی ئورووپادا زیاترە. خەڵکەکەی وان لەچاو هاووڵاتانی ڕێژیمە دیموکراتیکەکانی ئەمڕۆ لە ژێر دەسەڵاتێکی کەمتردابوون. جگەلەوەش، لەژێر ڕواڵەتی سەرەڕۆیی ئەواندا زۆرجار مەجاڵێکی باش بۆ دەوڵەتی ناوچەیی‌و پاشماوەی تاقمە هەڵبژێردراوەکانی سەدە نێوەڕاستییەکان مابۆوە. لە تەواوی مێژووی ئورووپادا، حکوومەتە سەرەڕۆو پاشایەتییەکان کەمتر لەوەی دەهاتنە بەرچاو، دەسەڵاتخواز بوون.

دیارە دەستێوەردانی لەخۆوەو ڕاستەوخۆو بێ شەرمانەی پاشا یان وەزیرەکانی چ لەبەرامبەر دوژمنە شەخسییەکانیاندا یان ئەو کەسانەی دەبوونە مایەی سەرئێشەیان، چ سەبارەت بە بەرژەوەندیی کەسانێك کە خۆشیان دەویستن، ئیدی ئەمڕۆ نیە. ئەم جۆرە دەستێوەردانە تەواو ئاشکرایە ــ مزاحیمەت ــ دەست بەسەرداگرتنی دارایی، زیندان، ئێعدام، بردنە سەری پلە، مافی پاوانکراوی لێخۆشبوون‌و بەرژەوەندیی تایبەتی ــ دەبوونە هۆی دژکردەوەی ڕەخنەگرانەو تووڕەیی. بەتایبەتی سەبارەت بەوە دادگاکان‌و وەفدە بەڕێوەبەرییەکان بەکردەوە نەیان دەتوانی پێشی پێ‌بگرن. لە حکوومەتی مۆدێرندا تەقریبەن سەرەڕۆیی هەر بەوڕادەیە باوی هەیە. بەڵام زیاتر لە ئاستەکانی خوارەوەی دەزگا دەوڵەتی‌یەکان دا دەبینرێ تا ئاستەکانی سەرەوەتر. ئەغلەب خۆیان لە شکڵ‌و پرۆسە قانوونی‌یەکان دا حەشار دەدەن. دادگاکان‌و وەفدە بەڕێوەبەری-یەکان هێندێك جار سکالاکانیان گوێ لێ دەبێ‌و جاروباریش ئەو"گەندەڵی‌یانە"ی کراون پووچەڵ دەکەنەوە یان بەشێوەی قانوونی باتڵی دەکەن. بۆیە دەستێوەردانی سەرەڕۆیانەو خێرا وا دێتە بەرچاو کە" بە پێی قانوون" ڕوودەدەن هەربۆیە مەشرووعن.

هونەرەکانی دەسەڵاتی قانوونی چاوەدێری ــ کۆکردنەوە ڕێکخستنی زانیاری‌یەکان، تۆماری بەڕێوەبردنی کاروبارەکان، دیاریکردنی باج، چاوەدێری، ئاگا لێ‌بوون، بەڕێوەبردن‌و شتی لەم بابەتەــ کەلەبەردەستی حاکمانی سەرەڕۆ دابوون، لەچاو ستانداردەکانی ئەمڕۆ زۆر سەرەتایی‌تر بوون. دۆزینەوەی بەڵگە بۆئەوەی ئەمە بسەلمێنێ زۆر هاسانە. واتە بەهۆی بەراوردکردنی جۆراوجۆری‌و ئاستەکانی ریزبەندیی باجەکان‌و چاوەدێری‌و زۆر بوونی ئیدارە دەوڵەتییەکان لەحکوومەتی مۆدێرندا یان ئەو قۆناغەی مەبەستمانە. ئێستا ئێمە تەقریبەن بۆ هەر چالاکییەك‌و هەر بوارێك، وەزارەتخانە، ئیدارەو



نووسینگەی جۆراوجۆری دەوڵەتیمان هەیە. بۆنموونە بۆ بواری وەك کاروباری بنەماڵە، ڕێژیمی خواردن، سلامەتی‌و لەشساغی، خوێندنی منداڵان، دامەزران، کشت‌وکاڵ، پیشەسازی، بازرگانی، فەرهەنگ‌و وەرزشەکان. ڕێژیمە دیموکراتیکەکان هەنگاوی بەپەلەو جۆراوجۆریان بۆ نەتەوەیی کردن‌و چاوەدێری هەڵێنایەوە. تا بەم جۆرە بتوانن کەڵك وەرگرتن لە زەوی‌وزار، دەسمایەدانان‌و دامەزراندنی هێزی ئینسانی بۆکار بخەنە ژێر چاوەدێریی خۆیانەوە. ئەمانە دراویان میللی کردو پەرەیان بە دراوی کاغەزی داو بۆ مەبەستە سیاسییەکانیان کەڵکیان لێ وەرگرت. لەو شتەدا" دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆو تەکرۆ" تەنیا دەیان توانی بەخەون بیری لێ بکەنەوە، واتە ئەوەکە خەڵکی وڵاتی خۆیان بکەنە سەرچاوەیەکی ئینسانی‌و بەپێی ویستی ڕۆژانەی خۆیان بەکاریان بێنن، دێموکراسییەکان بە باشی پێی‌گەیشتن. نەبوونی ئازادی‌و ڕێزگرتن لەمرۆڤ لە بەرگێکی دیکەدا بۆ گەیشتن بە"ئازادیی مەدەنی"و "بەرپرسایەتی" خۆی دەرخست: مافی دەنگدان درا بە هاووڵاتان‌و بەوەیان ترساندن کە هەرچی حکوومەت لە بەرامبەر ئەوانیدا دەکا، دەبێ تەنیا خۆیان سەرکۆنە بکەن. چونکە هەرچییەك بێ جگە لە" نوێنەری هەڵبژێراوی خۆیان" شتێکی دیکە نیە. هەرچەندە وەك پاسکاڵ ئاماژەی پێ دەکا: "بۆ پێڕەوی لەزۆرایەتی دەکەین؟ سەبارەت بەوەی ئەوان ئاقڵترن؟ نا، لەبەرئەوەیە دەسەڵاتیان زۆرترە" جێگەی سەرەکیی وی، دەسەڵات لە دەزگای حکوومەت دایە، دەزگایەك کە وەك سۆزانییەك هەرکەس بتوانێ پارەکەی بدا، خزمەتی دەکا. با ڕوونتر بڵێین، خزمەت بەسەرچاوەی قانوون دەکاو ئەو پارەیە بۆ خەرج دادەنێ کە مەئموورانی دەزگای حکوومەتی لە هاووڵاتانی خۆی وەردەگرێ. پاسکاڵ تەنیا ئەو بۆچوونە سەرەکییەی هابز مونعەکیس دەکا. لەبەرەوڕوو بوونەوەی زۆرایەتییەك دا کە لەلایەن پاوانخوازییەکی ڕێك خراوەوە پیشتیوانیی لێ‌دەکرێ، کە بەتوندوتیژی‌و کەسانی پڕۆفیشناڵی تەواو کات تەیارە، ترسنۆکی کارێکی ئاقلانەیەو کابرای تێ شکاو مل بۆ سەرکەوتوو ڕادەکێشێ. بۆیە دەسەڵاتی تەواویان دادتێ هەرچی پێیان خۆشە بیکەن. هاووڵاتان بەخۆ قانیع کردن بەوەکە ئەوە زۆرایەتییە حکوومەت دەکا، چونکە بۆخۆیان ئەمەیان ویستوە، خۆیان دەکەنە دەسەڵاتدارانی سەمبولیکی حکوومەت. بەپێی مەنتیقی نیوو ڕەواقیی هابزی، هاووڵاتان بە قانیع کردنی خۆیان تەنیا پێڕەوی لە فەرمانی ئەقڵ دەکەن. فەرمانێك بە هەموو کەس دەڵێ دژایەتی لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەی هەیە ئەگەر بەتەواوییش بێ‌ئاکام نەبێ، لانی کەم زۆر مەترسیدارە. دیموکراسیی مۆدێڕن، دیموکراسیی هابزییە.

## دەنگدەر وەك دەسەڵاتداری موتڵەق

وێنەی هاووڵات وەك دەسەڵاتدارێكی "بالقوە" یان ئیحتمالی لەو تاقیكارییە فكرییەی دا باسی دەكەین بە ئاشكرا دەردەكەوێ. ئەو نموونەیە دەمان باتە نێو دیموكراسیی مۆدێڕنی ڕۆژئاوایی كەلەودا دەسەڵاتی قانوون دانان هەم بەشێوەیەكی فەرمی موتڵەقە، هەم لەرووی ئامانجە كردەیی‌و بەرێوەبەرییەكان. جگە لەوەش، ئەمە ڕێژێمێكە لەودا حیزبە زۆرایەتییەكان لە پارلماندا، چ بەگوێرەی سوننەت‌و چە بەپێی قانوون، دەوڵەت پێك دێنن، لەحالێكدا تەواوی مافەكانی حیزبێكی پارلمانی ( وێڕای مافی دەنگدان لە كۆبوونەوەو كۆمیسیۆنە گشتی‌یەكان ) بەردەوام بۆخۆیان دەپارێزن. هەر ئەو حیزبە ( بە ئیئتیلاف لەگەڵ حیزبەكانی دی ) دەوڵەت‌و پارڵمان دەخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە. بەواتایەكی دی، بەقەول جیایی دەسەڵاتەكان دەبێتە شتێكی ڕواڵەتی، لانی‌كەم لەو جێگەیەدا كە پێوەندیی بە هێزی قانووندانان‌و بەرێوەبردنەوە هەیە.

هەڵبژاردنێك دێنینە بەرچاوی خۆمان، هەموو دەنگدەران جگە لە تاقە كەسێك لە ماڵێ ناچنەدەر. ئەو تاقە دەنگدەرە كە لەسەر سندووقی دەنگدان ئامادەیەو دەنگی خۆی دەسندووق داوێ، دیاری دەكا كە كام حیزب تەواوی كورسییەكانی پارڵمان داگیر دەكا. كەوابوو دەوڵەت پێك دێنێ‌و بەسەریدا زاڵ دەبێ. دەنگی وی، ئەو تاقە یەك دەنگە چارەنووس سازە. ئەو ئێستا لە پلەو مەكانی شایەكی تەواو عەیار ( و تاكڕەو ) دایە. ئەو كەسە دەی‌توانی وەزیرەكان‌و راوێژكارەكانی بە تەنیا هەڵ بژێرێ. بەرواڵەت سەبارەت بەوەكە بە پێی دەستوور مافەكانی هەر هاووڵاتێكی دەنگدەر لەگەڵ خەڵكی دیكە یەكسانە، "هەر" هاووڵاتێك خاوەنی مافی هەڵبژاردنی كەسێكە دەبێ بەشێوەی سەرەرۆیانە حكوومەت بكا. دیارە لە ڕاستی هیچ هاووڵاتێك بەتەنیا خاوەنی دەسەڵاتێكی واقعی بۆكارێكی ئاوا نیە، چونكە لە ڕۆژی هەڵبژاردندا دەنگدارانی دیكە لە ماڵێ دا نامێننەوە.

هەرچەند دیاردەی بێ‌موبالاتیی دەنگدەر كە لە هەموو شوێنێك هەیە، تاقیكاریی فكریی ئێمە لەسەر گومانێك دامەزراوە كە موبالەغەیە. هەرچەند خاڵی سەرەكی ئەوەیە ئەگەر هەڵبژاردن بە شێوەیەكی "دروست" ڕێك بخرێ‌و بەرێوە ببرێ، ئەو زۆرایەتییەی دەرچووە، لەرووی دیموكراسییەوە مەشرووع‌و قانوونییە. مەشرووعیەتەكەی لە چەمكێكی تەواو حقووقی‌و قانوونیدا، بە هۆی ئەم



ڕاستییەوە ناكەوێتە ژێر پرسیار كە تاقە دەنگدەرێك هاتۆتە سەر سندووقەكان. زۆرایەتیی دەنگدەرانی واقعی حەتمەن زۆرایەتیی هاووڵاتان یان خەڵكی خاوەن دەنگ نیە.

لێرەدا سەلماندنێكی دیكە لەبارەی تایبەتمەندیی دیموكراسیی مۆدێڕنی هابزیدا دەبینین. لەرێژیمێكی موتڵەقخوازی هابزی‌و نموونەی ( كلاسیك ) دا، دەسەڵاتدار لە جیاتی ١٠٠٪ ی خەڵكەكەی دەوڵەت هەڵدەبژێرێ. لەم بارەیەوە تەنیا لێكدانەوەی دروست هەر ئەمەیە. دەسەڵاتدارەتیی هابزی قانوونگەلێك پێك دێنێ كە پێشتر دەسەڵاتی ئەمەی لەلایەن تەواوی هاووڵاتانەوە وەرگرتوەو بۆخۆی نوێنگەیەك لە قانوونەكانە. لەرێژیمێكی سادەی دێموكراتیدا بە تەنیا دوو حیزبەوە، بە ٥٠٪ دەنگەوە ( لە لایەن دوو حیزبەوە بێ ئەوەی دەنگێك لە ٥٠٪ زیاتر یان كەمتر بێ ) بەمانای ١٠٠٪ دەنگەكانی n دەنگە( لە حالێكدا كە n ئاكامە ) بەڵام ٥٠٪ بەزیادكراوی دەژمێردرێ. زۆرایەتی"نوێنەری"هاووڵاتانەو دەست دەكا بە دانانی قانوون گەلی نوێ بە گوێرەی تیئۆرییە دێموكراتیكییەكان. دەسەڵاتی ئەمە لە پێشدا لە تێكڕای خەڵك وەرگیراوە. دەنگدەرە سەربەخۆیەكان ( لەگەڵ كەسانێك ئاكامی دوایی ئەم هەڵبژاردنە یەكسانە بە ١ تەنیا یەك n دەسندووق داوێن. كاتێك بە شێوەی ڕێژەیی، n دیاری دەكەن) دەنگی چارەنووسسازی دەنگدەرێكی سەربەخۆ هەیە. ئەو دیاری دەكا كە كام حیزب دەبێ زۆرینەی پارلمان‌و پێكهێنانی حكوومەت بە ئەستۆوە بگرێ. دەنگی وی چارەنووسی ١٠٠٪ دەنگەكانی دیكە دیاری دەكاو ١٠٠٪ خەڵكی ( وڵاتی ) ئەم حكوومەتە پێكەوە دەبەستێتەوەو ئەركدار دەكا. ڕاست وەك ئەوەیە ئەو دەسەڵاتدارێكی هابزیی "نموونە"ی ( كلاسیك )ە.

دیارە دەنگدەری سەربەخۆ ئەغڵەب لە پێشدا نەناسیاوە، تەنانەت بۆ خودی خۆشی. جاری وایە ڕەنگە بەوردبینییەكی تەقریبی گرووپێك بناسرێ‌و لەنێو ئەواندا دەنگدەری سەربەخۆ بدۆزرێتەوە. هەرچەند مەسەلەكە ئەوەیە هەر چۆنێك بێ دەنگدەری سەربەخۆ هەر كەس بێ، كاریگەریی لەسەر سەلاحییەتی حقووقی ــ قانوونیی ئەو دەوڵەتە نیە كە دەسەڵاتی پێ دەبەخشێ.

سیستەمی چەند حیزبییە نوێیەكان هەر ئەوەندە سەرەرۆن كە سیستەمە دوو حیزبییەكان بوون. هەرچەند لە سیستەم چەند حیزبییەكاندا، ڕۆڵی دەنگدەرە سەربەخۆیە(كان) كەمتر دیارە. هۆیەكەی ئەوەیە زۆرجار هەڵبژاردن بە تەنیا دیاری دەكا كام ئیئتیلافی زۆرایەتی ئیمكانی هەیە. هەڵبژاردن بە

دەگمەن هەلومەرجێك دەخولقێنێ حیزبەكان بتوانن تەنیا ئیتیلافێكی زۆرایەتی پێك بێنن ـــ واتە تاقە دابەشبوونێك لەنێوان زۆرایەتیو گرووپی رقەبەردا. بەدەگمەن هەلومەرجێك پێك دێ تاقە حیزبێك بتوانێ زۆرایەتیی پارلمانی لەبەردەست دابێو دەوڵەتێكی تاك حیزبی پێك بێنێ. لە ئاكام دا زۆرجار، ئۆلیگاریشییەك لە ڕێبەرانی حیزبە سیاسییەكان( لەوانەشە ڕێبەرانی هێندێك گرووپی بەهێز، كەلەپشت پەردە خەریكی جموجۆڵن ) خەریكی وتووێژێكی كەم یان زۆر كۆنترۆڵ كراون بۆئەوەی ئیتیلافێكی لانیكەم زۆرایەتی پێك بێنن. لە ڕاستیدا هەرچەند ئیئتیلافی زۆرایەتی بچووكتر بێ، ئەندامانی ئیئتیلافی سەرەكی دەسەڵاتێكی كەمتریان بۆ دابەشكردن هەیە. دیارە دوور نیە لانی كەمیی ئیئتیلافی زۆرایەتی كاتێك ئەو ئیتیلافە لە بەشێكی زۆری حیزبگەلێكی زۆر كە وێكچوونیان كەمە، لەبەرچاوان ون بێ. بۆ نموونە ئەوەی لە چاو خشاندنێكدا وەك زۆرایەتییەكی گەورە لە سۆسیالیستەكان و دێموكرات مەسیحییەكان دێتە بەرچاو لە ڕاستیدا شتێك لە ئیئتیلافێكی لاواز لە قۆڵە كرێكارییەكانی ئەم دوو حیزبە زیاتر نەبێ. لەنێو هەر حیزبێكیشدا "سەركەوتووەكان دەست بەسەر هەموو شت دادەگرن". تاقە ئەندامێكی مەكتەبی سیاسی یان كۆڕی گشتی دەتوانێ بڕیاری حیزب بگۆڕێ. بەم جۆرە هەموو حیزبەكە ناچارە بچێتە نێو ئیئتیلافێك لە جیاتی ئیئتیلافێكی دیكە. هەر كە جارێك ئیئتیلافێك پێك هات، ئەوی دیكە مەسەلەیەكە پێوەندیی بە درێژەدانی پرەنسیپەكانی حیزب لەرێگەی بەكارهێنانی لێزانانەی تەوژمو هاندانی ئەندامانو ڕەنگە بەرپرسانی سەرپێچی كەری حیزب ( بەخشین یان لێ ئەستاندنەوەی پلەو مافی چالاكی، پۆستو پلەو پایە، چوونە سەری پلە، ڕێككەوتنەكانو قۆنتراتەكانو ...هتد.)

سیستەمە چەند حیزبییەكان لە هێندێك بارەوە لەچاو سیستەمە دووحیزبییەكان كەمتر "دیموكراتیك"ن. لە سیستەمێكی دوو حیزبیدا، دەنگدەران دەنگە چارەنووسسازەكانیان دەسندووقەكان داوێن، تەنانەت ئەگەر ژمارەیەكی كەمیش دەنگدەری سەربەخۆ هەبێ. لەلایەكی دیكەوە لە سیستەمە چەند حیزبییەكاندا دەنگدەران دەتوانن وەرەق ببڕن بەڵام بۆخۆیان لە گەمەكەدا بەشدار نەبن. چەند ئۆلیگاریش كارە چارەنووسسازەكان ئەنجام دەدەن. بۆیە، جاری وایە وای لێ دێ تیمێك لە ئۆلیگاریشەكان ئیئتیلافێكی زەبەلاح پێك دێنن تاكوو ئەو حیزبەی بەرزترین ژمارەی دەنگەكانی وەدەست هێناوە لە دەسەڵات بخەن.



## مافی دەنگدان

لە دیموكراسییەكی هابزیدا دەنگدان شێوەیەك بۆ هەڵبژاردنی نوێنەران نییە. بەڵكوو بۆ دیاریكردنی كەسێكە دەبێ جێگەی پۆستی دەسەڵاتدار بگرێ. لێرەدا لەگەڵ مەسەلەیەكی بەئاشكرا ئەخلاقی بەرەوڕووین. با تاوێك بگەڕێینەوە سەر ئەو نموونە فەرزییەی پێشتر باسمان كرد. ئەو تاقە كەسە دەنگدەرەی رۆژی هەڵبژاردن سەروسەكوتی لەسەر سندووقی دەنگدان دەردەكەوێ، كەسێك ( یان ئەگەر ڕێوشوێنی هەڵبژاردن ئیزن بدا چەند كەسێك ) دیاری دەكا كە هەموو كورسییەكانی نوێنەران داگیر دەكا. هەر لەم كاتەشدا ئەو حیزبێكیش دیاری دەكا دەوڵەت پێك بێنێ. ئەو دەزانێ یان دەبێ بزانێ هەڵبژاردنی وی ـــ ئەگەر بڕیار بێ وەك ئەو نموونەیەی ئێمە چارەنوو ساز بێ ـــ دیاری دەكا كە دەبێ فەرمانڕەوایی نەك تەنیا بەسەر وی دا بەڵكوو بەسەر هەر كەسێكی دیكە لەو حكوومەتەدا بكا. لە ئاكامدا، ئەو دەبێ بزانێ لە دەنگدانێكدا بەشدار دەبێ چارەنووسی كەسێك دیاری دەكا كە دەبێ بەسەر هەموو خەڵكی ئەو حكوومەتەدا، حكوومەت بكا. هەروەها دەبێ بزانێ ئەگەر هەلومەرج لەبار بێ دەنگی وی كاریگەرییەكی ئەوتۆی هەیە. بەم جۆرە ئەوەی بۆ دەنگدەرێك لەو نموونە فەرزییەی ئێمەدا ڕاستە، بۆ دەنگدەرێكی سەربەخۆی دیكە لە هەڵبژاردنێكی چڕوپڕیش دا ڕاستەو لەڕاستیدا بۆ هەموو دەنگدەرێك هەروایە. هۆیەكەی ئەوەیە مافی قانوونیی دەنگدەران بێگوێدان بەوەكە ئەمانە یان ئەوانی دیكە چۆن دەنگ دەدەن یان ئەوە هەر لە جێدا ئەمانە یان ئەوانی دیكە دەنگ دەدەن یان نا، بەرابەرە. بەم جۆرە دەبینین بنەمای قانوونیی دەنگدان لە دیموكراسییەكەی هابزیدا ئەوەیە هەركەس خاوەنی مافی حكوومەت كردن بەسەر هەموو مرۆڤەكانی دیكە لەو حكوومەتەدایە ( تەنانەت ئەگەر مەبەست ئەوە بێ تەنیا چەند كەس لە حكوومەتدا بەسەر ئەوانی دیكەدا سەركەون).

وا دابنێین دەنگدەرێك لەخۆی بپرسێ داخوا ئەو مافی ئەوەی هەیە كەسێك هەڵ بژێرێ بەسەر ژیانی تەواوی خەڵكی ژێر دەسەڵاتی ئەو حكوومەتەدا فەرمانڕەوایی بكا. گومانی تێدا نیە ئەو لەرووی قانوونییەوە مافی ئەو هەڵبژاردنەی هەیە. هەرچەند دەتوانین وا دابنێین ئەو مرۆڤێكی ئەوەندە نەزان نیە پێی وابێ "ماف" مانایەكەی تەنیا "مافی قانوونی"یە. نابێ پێمان وابێ

سەرچاوەی چەمکی ماف تەنیا حکوومەتی قانوونییە، ئەم مەسەلەیە دیارە لەبارەی مافە سروشتییەکان دا بە تەواوی روونە، مافگەلێك کە تەنیا یەك نەزم لە ئەفرادی جیا لە یەکتر لە هەمان جۆری سروشتییەکەی بە سەلمێندراو دەزانێ ــ نەزمێك لە "مرۆڤە ئازادو بەرابەرەکان"ەوە بە قەد مافە ئەخلاقییەکان روونو ئاشکرایەو بوونی هاودەنگییەکی قووڵ لە باوەڕو بایەخەکان لەنێو مرۆڤە ئازادو بەرابەرەکاندا بەشتێکی سەلمێندراو دادەنێ ــ بە کورتی "وێکچوونی فەرهەنگی" دەتوانێ، بەڵام نابێ حەتمەن، لەگەڵ هەر سیستەمێکی سیاسی ــ قانوونیدا بگونجێ.

سەبارەت بەوەکە مافە سروشتیو ئەخلاقییەکان لە هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتیو سیاسی جیان، دەنگدان نەمافێکی سروشتییەو نەئەخلاقی. لە ئاکامدا، لە حاڵێکدا هێندێك مافی قانوونی دەکرێ لەریزی مافە سروشتیو ئەخلاقییەکان دابن کە لە دەسەڵاتێکی قانوونیی تایبەتدا قانوونیو بەفەرمی پەسند کراون، بەڵام مافە قانوونییەکانی دیکە تەنیا خەڵاتن یان ئەو "دەسەڵاتانە"ن لەلایەن دامەزرێنەرانەوە یان کاربەدەستانی مەسئوولی سیستەمێکی قانوونی بەخشیونی. دەنگدان لەمەی دواییدا باسمان کرد جێی دەبێتەوەو هەمیشە لە هەلومەرجێکی دەسکرددا دروست دەبێ ــ رێکخستنەکان، یانەکان، کۆمپانییەکان، ئەنجومەنەکان یان کۆمەڵەکان ــ ئەمانە لەلایەن قانوونە روونو لێبڕاوەکانەوە دیاری دەکرێنو لە لایەن پێوانە فەرمیو شوێنو مەکانەکان لە هەر رێکخستنێکەوە دیاری کراون. بەواتایەکی روونتر دەنگدان تەنانەت مافێك نیە لەرووی قانوونییەوە بەرەسمی ناسرابێ، بەڵکوو لە باشترین حاڵەتدا تەنیا دەسەڵاتێکە لە رووی قانوونییەوە پێك هاتوەو لە پێڕەوی نێوخۆی رێکخستنێکی تایبەتدا تۆمار کراوە. دەستوور یان ئەو قانوونەی بە گوێرەی دەستوور پەسند کراوە، بەشێوەیەکی راستەوخۆ دیاری دەکا چ شتێك لەو رێکخستنەدا پێویستیی بە دەنگدانە. بەشێوەیەکی ناراستەوخۆش دیاری دەکا کام مرۆڤی سروشتی دەتوانێ بە دابین کردنی ئەو پێوانانەی دیاری کراون، دەنگ بدەن. واتە بڕیارەکە ئەوەیە ئەوان لە بەدەستەوەگرتنی یەك یان چەند پۆستدا پەسند بکرێن یان بە گونجاو بزانرێن.

لە زۆربەی دەستوورەکاندا دەنگدان تەنیا "مافێکی قانوونی"یە نەك ئەرك کە لەرووی قانوونییەوە خەڵك ئەرکی سەرشانیان بێ بەرێوەبەری بەرن. بەم جۆرە رەنگە هەر هاووڵاتێك بە شێوەیەکی مەعقوول لەخۆی بپرسێ داخوا وەك کەسێکی بە



شەڕەفو ئەرکناس خاوەنی مافێکە بۆکەڵك وەرگرتن لەو مافەی حکوومەت پێی بەخشیوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەروونی دەبێ بۆ زاتی ئەو حکوومەتە تایبەتە بگەڕێتەوە، یان بۆ ئەو شتەی لە هەڵبژاردندا دەکەوێتە بەرمەترسییەوە یان بۆ شێوەکانی دیکەی دەنگدانو چۆنیەتیی رێك خستنیان. تائێرە دیتمان زاتی دیموکراسیی هابزی چیەو لە رووداوی هەڵبژاردنەکانیدا ئەو شتانە دەکەونە بەر مەترسییەوە چن. لەبارەی مافی بەشداریکردنی مروڤ لەو رووداوانەدا دەبێ چ بڵێین؟

بێگومان، ئەگەر کەسێك لەسەر ئەو باوەڕەبێ خاوەنی مافێکە بۆ هەڵبژاردنی کەسێك ئەو کەسە بەسەر هەموو خەڵکدا فەرمانڕەوایی بکا، کەوابوو دەبێ ئەو باوەڕی وابێ"ئەو " خاوەنی مافی حکوومەت کردن بەسەر خەڵکی دیکەیدا هەیە. شتێکی ئەوتۆ کاتێك حاشاهەڵنەگرە کە رێوشوێنی هەڵبژاردن رێگەی بدا بتوانێ وەك کاندیدا لە هەڵبژاردن دا بەشدار بێ ــ ئەو شتەی بۆ زۆرکەس لە خەڵکی ژێر دەسەڵاتی حکوومەت راستە. هەروەها ئەگەر رێوشوێنی هەڵبژاردن بتوانێ رێگەی بدا ناوی کەسێك لە دەرەوەی لیستی کاندیداکان لە بەرگەی دەنگی خۆی دابنووسێ ئەوەش حاشاهەڵنەگرە. لەهەردوو حاڵەتدا ئەو خاوەنی مافی قانوونی بۆ هەڵبژاردنی خۆیەتی وەکوو کەسێك کەبەسەر هەموو خەڵکدا حکوومەت دەکا.

بێگومان مرۆڤێکی هابزی لەسەر ئەو باوەڕەیە هەرکەس، و کەوابوو بۆخۆشی، خاوەنی مافی حکوومەت کردنە بەسەر هەر کەسێکی دیکەدا ــ واتە مافی رەتکردنەوەی ئەو مافەی خەڵکی دی لە ژیانی خۆیاندا هەیانەو مافی گۆڕینی خەڵك بە ئامرازێك لە پێناوی تەماحو هەواو هەوەسی گەیشتن بە دەسەڵات. لەراستیدا ئەوە ئەو باوەڕەیە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ببێتە مرۆڤێکی هابزی. ماف یەکسانە بە دەسەڵات، ماف واتە پلەو پایە.

بەڵام ژمارەی هابزییەکان چەندە؟ بێگومان زۆر رووناکبیر وا نیشان دەدەن هابزین، رەنگە لەبەرئەوە بێ هابزی بوون وەك شەڕێك دەچێ. ئەم هەستو بۆچوونە دروست دەکا کە ئەو کەسە واقعیەیە کە گوێ ناداتە هەستو کەفو کوڵ. بەڵام دەبێ بزانین ئەوانە منداڵەکانی خۆیان چۆن پەروەردە دەکەن. تا ئەو جێگەیەی ئەمن دیومە تەنیا ژمارەیەکی کەمیان هابزی گەرایی فێری منداڵەکانیان دەکەن. داخوا ئەمانە هابزییەکی راستگۆنو دایك باوکیان درۆزنن؟ یان ئەوانە

دەچنە جەنگەڵستانی ئەمنی ئاکادیمی‌و دەبنە لایەنگری هابز. ئەوە راستە ژمارەیەکی بەرچاو لە دژی گەلییەکان( پەسیکوپاتەکان ) لەنێو هەموو چین‌و توێژێکدا هەن کە سەرنجی مرۆڤ بۆلای خۆیان رادەکێشن. بەڵام ژمارەی ئەمانە زۆر لەوە کەمترە ئەو گومانە پێك بێنێ کە هەر کەسێك بۆخۆی هابزییەکە. هیچ هۆیەك بۆ سەلماندنی راستیی ئەم گومانە نیە کە هەر دەنگدەرێك بەراستی پێی وابێ مافی ئەوەی هەیە بەسەر خەڵکی دیکەدا حکوومەت بکا. لە ئاکامدا ئەگەر دەنگدەر بەوردی لە مەسەلەکە بڕوانێ، رەنگە بەو ئاکامە بگا کە دەنگدان بۆوی کارێکی هەڵەیە. بەو حاڵەش رەنگە ئەو هێشتا وابیر بکاتەوە چونکە "خەڵکی دیکەش هەموویان دەنگ دەدەن" کەوابوو هەرچۆنێك بێ دەنگدانی ویش قەیدی ناکا. تەنانەت ئەگەر واش بێ، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەسەلەیەکی ئەوتۆ شتێکی سەیر نیە کاتێك دەبینین زۆربەی خەڵك خاوەنی بیروبۆچونێکن کە لەگەڵ ئەم بیروباوەڕە ناگونجێ کە پێی وایە دەنگدان ــ بەخشینی دەسەڵات بە هێندێك کەسە بۆئەوەی بەسەر خەڵکی دا حکوومەت بکەن ــ لەرووی ئەخلاقییەوە پاساو دەدرێ. بەڵام هەرچۆنێك بێ مەنتیقی:" هەموو کەسیش ئەم کارەی دەکا" بەزەحمەت دەتوانێ وەك ئیستیدلالێکی ئەخلاقی‌و جێی رەزامەندی بێ. ئەگەر ئەوە ڕاست بێ "هەر کەسێك ئەو کارەی دەکا" ــ ئەغلەب واش نیە ــ ئەوەی زۆر ڕێی تێ دەچێ ئەوەیە خەڵك روو لەو بۆچوونە دەکەن دەنگدان لەرووی ئەخلاقییەوە کردەوەیەکی باشە، بەڵام ئەوە کە ئەوان باوەڕیان بە شتێکی ئەوتۆ بێ، هۆیەکەی ئەوەیە ئەوان ئەو چەمك‌و مانایە بدەن بە دەنگی خۆیان کە رێوشوێنی هەڵبژاردنی هابزی هەیەتی، رەنگە ئەوان تەنیا وەك "دەربڕینی بیروبۆچوونی کەسیی حۆیان" سەیری دەنگدان بکەن نەك وەك هەنگاوێك‌و کردەوەیەك کە کاریگەرییەکی بەربڵاوی لە سەر ژیان‌و چارەنووسی خەڵك هەیە. بەلایەنێکیش ئەوان مافی خۆیانە ئاوا بیر بکەنەوە. دەنگدانی ئەمانە ئەو دەسەڵاتانە ناگۆڕێ بەگوێرەی دەستووری حکوومەت یان ئۆرگانە زۆرەکانی دامەزراون، واتە هەرچۆنێك بێ قەرارێکی وا لە گۆڕێدا نیە. بەگوێرەی ئەم واتایە، هەر لە جێدا هیچ شتێك پێوەندیی بەچۆنیەتیی دەنگدانی خەڵك یان داخوا لە دەنگداندا بەشدار دەبن یان نا، نیە. لەروانگەی دەستوورەوە، ئەوان پێڕەوانی ئەو دەسەڵاتەن کە بەر لە دەنگدان بوون. کەوابوو رەنگە بکرێ تارادەیەك ئەم بۆچوونانەیان پاساو



بدرێ کە دەڵێ لە دەنگداندا هەر چۆنێك بێ هیچ شتێکی گرنگ ناکەوێتە مەترسییەوە. لەلایەکی دیکەوە، ئەوان دەبێ پێیان وابێ قەرارە دەنگەکانیان سەرەنجام کاریگەرییەکی هەبێ ــ رەنگە هەشی بێ. ئەگەر ئەوان پێیان وانەبێ، ئەدی هەر لەجێدا مەبەستیان لە دەنگدان چیە؟ هەرچەند لە دێموکراسییەکەی هابزیدا هەڵبژاردن بۆوان دەکرێ بۆئەوەی دیاری بکرێ دەبێ چ کەسێك دەسەڵاتداری موتلەق بێ‌و دەسەڵاتی باشکردن‌و وێران کردنی ژیانی خەڵکێکی زۆر بەدەستەوە بگرێ‌و مەسەلە بنەماڵەیی، حەشیمەتی‌و کاروپیشەییەکان بشوێنێ. کاتێك مەسەلەکە بەم جۆرەیە، کەوابوو پرسیار کردن لە خەڵك بۆئەوەی وردبینییەکی زیاتریان هەبێ‌و سەرنجێکی زیاتر بدەنە رەوتی هەڵبژاردن‌و بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا، چاوەڕوانییەکی زۆر نیە.

ئەگەر بەم ئیستیدلالەوە هەنگاوێك بەرەوپێش بچین، دەتوانین ئەو پرسیارە بێنینە گۆڕێ ئەو رێکخستنەی رێگە دەدا ( لە راستیدا بانگهێشتن دەکا ) خەڵك تەنیا لەسەر بنەمای ئەم گومانە کە ئەوان خاوەنی مافی حکوومەت کردن بەسەر خەڵکی دیکەدان هەنگاو بنێن ( لە هەڵبژاردندا بەشدار بن )، ئایا لەرووی ئەخلاقییەوە رێگەی پێدراوەو پاساوی هەیە یان شایانی سەرکۆنە نیە؟ رەنگە وابیر بکرێتەوە ئەو رێکخستنە شایانی سەرکۆنە کردنە، تەنانەت ئەگەر هۆیەکەی هەر ئەوەبێ ئەو رێکخستنە کەسانێك سزا دەدا ئەو گومانە بنەمایە قبووڵ ناکاو لەو رێکخستنەدا بەشدار نابێ. لەحاڵێکدا مەشرووعیەتێکی درۆیی بۆ ئەو کەسانە پێك دێنێ کە ئەو گومانە بنەماییە قبووڵ دەکەن‌و بەم جۆرە یارمەتی بە داڕشتنی بناخەی حکوومەتی ژمارەیەك بەسەر ژمارەیەکی دیکەدا دەکەن.

دیموکراسی جاری وایە دەوڵەتی پەسند یان ئەگەر بە تەوازوعەوە بگوترێ، دەوڵەتی جێی پەسندی زۆرایەتیی پێدەگوترێ. هەرچەند ناکرێ دێموکراسیی هابز وەك دەوڵەتێك لەسەر بنەمای پەسند ( یان رەزامەندیی گشتی ) دیاری بکرێ. مەگەر ئەوەکە گومانێکمان لەسەر ئەوە دانابێ کە هەر کەسێکی ژێردەسەڵاتی حکوومەت لە بەرامبەر هەر فەرمانێکدا "مل بدا" کە لەسەرەوەڕا دەردرێ. ئەویش کاری بەوە نەدابێ چۆن و بۆچی لە هەڵبژاردن دا بەشدار بووە ( یان نەبووە ). بێگومان لەم روانگەیەوە هەڵبژاردن‌و دەنگدان ئیدی خاڵی هاوبەشی لەگەڵ پەسندکردن‌و رەزامەندی‌و مل راکێشان نابێ. بۆیە بەرواڵەت، بەگوێرەی

دێموکراسیی هابزی، ڕەزامەندی ئیدی لەلایەنی دێموکراتیکیی حکوومەتەوە سەرچاوە ناگرێ، مەگەر بەگوێرەی هابزییەکەی، ئەمانە ئیستیدلالێکی ناسراون.

یەکەم، هێندێك لە دەنگدەران تەنیا دەنگ بە حیزبێکی تایبەت دەدەن. چونکە لەوە دەترسن حیزبێکی دیکە حکوومەتیان بەسەر دابکا. وا دابنێین سەرەنجام حیزبەکەی دیکە لە هەڵبژاردن دا بردوویەتەوە. بە پێی چ چەمکێك ئەم دەنگدەرانە رازین سەرکەوتووەکانی هەڵبژاردن حکوومەتیان بەسەردا بکا؟ بێگومان ئەم وەڵامە باوە کە دەڵێ ئەوان رازین، چونکە لە هەڵبژاردندا بەشدار بوون هەر بۆیە پێشەکی ئەوەیان قبووڵە ڕەنگە لە هەڵبژاردندا بی دۆڕێنن، بۆ هێندێك کەس راستە، بەڵام قانوونێکی گشتیی دەروونناسی نیە. کەسێکی دیکە ڕەنگە هەر بەپێی ئەم مەنتیقە بڵێ یەکێك لە بەرامبەر هێرشێکدا کە دوایە دەردەکەوێ ئەو هێرشە سەرنەکەوتوە، بەرگری لەخۆی دەکا، ئەو کەسە بە گوژرانی خۆی رازی بووە.

دووهەم، هێندێك لەو کەسانەی دەنگ دەدەن، چ سەربکەونو چ بدۆڕێن، ڕەنگە زوو تێبگەن هەرچۆنێك بێ یەکێك حکوومەتیان بەسەردا دەکا، ئەویش بێگوێدان بەوەکە چۆن دەنگ دەدەن یان هەر لە جێدا دەنگ دەدەن یان نا. لە ئاکامدا هەرکام لەوانە ڕەنگە بەو ئاکامە بگا حەتمەن بە نەدانی دەنگ چی پێنابڕێ. بەڵام ڕەنگە ئەگەر دەنگ بدا ئەگەرێکی کەم هەیە بتوانێ کەسێك بێ لە دەستی دێ ( وەك دەنگدەرێکی غەیرە حیزبی ) شوێن لەسەر ئاکامی نیهایی هەڵبژاردن دابنێ. بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا بەم بۆچوونەوە ناکرێ نیشانەی ڕەزامەندی بێ. هەر بەم جۆرە، کاتێك کەسێك بۆ بەشداریکردن لە لوتاری ( یانسیب )یەکدا بلێتێك دەکڕێ، و دەشزانێ خەڵاتەکانی ئەم لوتارییە بەماڵیاتی تەواوی خەڵك، تەنانەت ئەوانەش بەشدار نین، ئامادە دەکرێ، بەمانای پشتیوانی لەو لوتارییە نیە. بەڵکوو زۆر وێ دەچێ هەوڵێکی بێئاکام بێ بۆ کەم کردنەوەی زەرەرو زیانێك ئەو مالیاتانە بۆیان دروست کردوە. لێرەدا دەبینین لە دیموکراسیی هابزیدا تەنانەت ناتوانێ بڵێ خاوەنی حکوومەتێکە بە پێی ڕەزامەندیی زۆرایەتی. ژمارەی ئەو کەسانەی تەنیا لە بەر ئەم هۆیە دەنگ دەدەن کە وا هەست دەکەن بۆ بەشداری لە هەڵبژاردندا لە ژێر فشار دابوون، بێگومان زۆر لە سەرێیە.



دەنگدەری غەیرە حیزبی ( کە ڕۆڵی چارەنووسسازی لە ئاکامی یەکجاریی هەڵبژاردن دا هەیە ) ڕەنگە هەر لە نێو ئەم کەسانەدا بێ. ئەوە کە ئەوان دەنگ دەدەن بە حیزبێکی تایبەت بەومانایە نیە رازین بەوەی هەر لەلایەن ئەم حیزبەوە حکوومەتیان بەسەردا بکرێ.

سێیەم، بە چ هۆیەك ئەو کەسانەی دەسەڵاتی خۆیان بەکار ناهێنن، رازین بەوەی لەلایەن هەر کەسەوە لە هەڵبژاردندا سەردەکەوێ، حکوومەتیان بەسەردا بکرێ؟ ڕەنگە وابیر بکرێتەوە، بێدەنگی نیشانەی رازی بوونە. بەڵام ئەم شێوە بیرکردنەوەیە هەڵەیەکی ئاشکرایە. هێندێك کەس کە دەنگ نادەن ڕەنگە لەبەرئەوە بێ بەشێوەیەکی تەمو مژاوی تێدەگەن لە ئەسپاردنی حکوومەت بەدەستی چەندین ژنو پیاوی دەسەڵاتخواز بۆ حکوومەت کردن بەسەر خەڵکی دیکەدا، دەبێ گرێیەك هەبێ. "خۆپاراستنی" ئەمانە بەوە لێك بدرێتەوە کە رازین، ئیدی بۆچوونێکی کارەسات بارە.

دیارە هەروەك دیتمان"ڕەزامەندی"ی هابزی تەنیا لێکدانەوەی خەیاڵێکە بۆ مرۆڤی ژێرچەپۆك. ڕەزامەندیی ئەو کەسەی حکوومەتی بەسەردا دەکرێ لە بەرامبەر حکوومەتی دەسەڵاتداردا ـــ بەگوێرەی مەنتیقی هابزی ـــ چونکە لە ژێر حکوومەتی حاکم دایە پاساوێکی بەسە بۆئەوەی ئیددیعا بکرێ ئەو کەسە دەسەڵاتی حکوومەت کردنی داوەتە دەست حاکم.

## نابەرپرسایەتیی نیهادینەکراو

لە دێموکراسییەکەی هابزیدا، هەڵبژاردن کاردروستایەتییەکی قانوونییە بۆ دیاریکردنی کاربەدەستان بە دەسەڵاتی موتڵەقەوە. ئەو کاربەدەستانە خاوەنی هیچ چەشنە بەرپرسایەتییەك بەمانای واقعیی وشە نین. لەبارەی هەڵبژێرو دەنگدارانی تاکیشەوە ئەمە قسەیەکی راستە. بێگومان دەکرێ ئەو فەرمانڕەوایانەی هەڵبژێراون لەرێگەی هەڵبژاردنیشەوە لە دەسەڵات بکەون. ئەمە مەرجێکە هێندێك کەس بە سەلمێندراوی ئەوەی دەزانن لە دیموکراسیی هابزیدا دەسەڵاتداران"لەرووی سیاسییەوە مەسئوولن" هەرچەند ژمارەیەکی زۆر کەم لە دەستوورەکان ( ئەگەر دەستووری وا هەر هەشبن ) هەڵبژاردن بە هەر شکڵو شێوەیەك بێ، پێوەند دەدەن بە وەڵامدانەوەی قانوونیو نیهادینەکراو. هەروەك زۆر بەرلەوە دیموکریتووس ئاماژەی پێکردوە، دەنگدەران ڕەنگە بە هەر هۆیەك ـــ یان هەرلە

جێ دا بەبێ هۆ ـــ خۆ لە هەڵبژاردنەوەی سەرلەنوێی بەرپرسان بپارێزن. جگە لەوەش، زۆر جار"بەرپرسایەتیی سیاسی" تەنیا بەومانایە بووە هێندێك لە مۆرەكانی حكوومەت دەبێ بۆ كاروكردەوەكانیان لەبەرامبەر مۆرەكانی دیكەی هەمان حكوومەتدا وەڵامدەر بن. لە هەموو رێكخستنە ئاڵۆزەكاندا شتێكی ئەوتۆ باوەو لە دێموكراسیی هابزیدا تایبەتمەندییەكی نائاسایی نیە.

ئەوەی گرنگیی زیاتری هەیە ئەوەیە ئەو كەسانەی دەبنە قوربانیی دەسەڵاتدارانو سیاسەتەكانیان رێگەیەكی ئەوتۆیان لەبەردەم نیە تاكوو داوای قەرەبوو كردنەوەی زیانەكانیان لە رێبەران یان ئەو دەنگدەرانەی ئەو كەسانەیان بردۆتە بەرزترین پلەی دەسەڵات، بكەن. دەنگدەران دەسەڵاتی خۆیان دەدەن بە رێبەران، بۆیە دەبێ ئەوانە لە رووی قانوونییەوە بەرپرسایەتیی كاروكردەوەكانی رێبەر قبووڵ بكەن. دیارە جگە لە خودی حكوومەت ئەگینا كەسێكی دیكە ناتوانێ دیاری بكا ئایا دەنگدەران دەتوانن كردەوەیەك یان پێداچوونەوەیەك بە هەڵبژاردنی خۆیاندا بكەن یان هەر لە جێدا شتێكی وا دەكرێ؟ وەكوو قاعیدەیەكی گشتی كاربەدەستانی حكوومەتو دەنگدەران وەڵامدەری هەرچی دەیكەن یان لەوانەیە بیكەن، نین. لە هەلومەرجێكی ئەوتۆدا ئارامییەكی كەم هەیە. لە حاڵێكدا چۆنیەتیی حكوومەتكردن لە گرتنەبەری بڕیاری پێویستدا ئەغلەب بەباشی پێناسە كراوە. بەڵام بەكردەوە هیچ چەشنە بەربەستێكی قانوونی ـــ بێگومان بەربەستێكی كاریگەر ـــ بۆئەوەی رەنگە ئەوان بیكەن، فەرمان بدەن، ئیزن بدەن، باج دابنێن، سزا بدەن، یان یارمەتی بكەن، بوونی نیە. بەسەرنجدان بەو شتانەیە دەسەڵاتی وان بەوجۆرەی چاوەڕوان دەكرێ، بەوردی لەرووی قانوونییەوە دیاری نەكراوە. بە شێوەیەكی لەم چەشنە، تا ئەو جێگەیەی پێوەندیی بە شێوەكانی دەنگدانەوە هەیە، دەسەڵاتی قانوونیی" دەنگدەران" بەباشی پێناسە كراوەو دیاری كراوە، بەڵام بە كردەوە سنوورێك بۆ جۆری ئەو بەرنامانەی بە قازانج یان بە زەرەریانە، نیە.

تەنانەت ئەگەر زۆربەی دەسەڵاتدارانو دەنگدەران خەڵكێكی لێوەشاوە بن، جێی ئەو رێكخستنە پڕناكانەوە كە نرخێكی گران بۆ نامەسئوولیەتیی كەسێك بەرەوا دەزانێ. باڵادەستترین كەس لە پاشایەتییەكی میرایەتییشدا دەتوانێ كەسێكی "مەسئوول" بێ. لەگەڵ ئەوەشدا هەموولایەك پاشاش دەناسنو چاوەڕوانیی لێدەكرێ هەتا ماوە لەسەركار وەمێنێو بەرنامەكانی لەلایەن میراتگرانییەوە درێژەیان هەبێ. سەبارەت بەوەكە ئەگەری زۆرە ئەو لە بەرامبەر هەر كردەوەیەكی



هەڵەدا رەخنەی لێ بگیرێ، ئەو بۆدانانی قانوونو پلان داڕشتنی درێژخایەن، تەمایەكی زۆری هەیە. لەبارەی گرووپی راوێژكارانو وەزیرەكانیشیدا ئەم شتە هەر راستە. واتە كەسانێك كە لە بەرامبەر فەرمانڕەوای خۆیاندا بەرپرسن. لەراستیدا ئەمانە كەسانێكن پاشا ( بەتایبەتی ئەو كاتەی ئەمانە ئیعتیبارو ئابڕووی پاشا دەخەنە مەترسییەوە، هەلومەرجو پلەوپایەی وی ئیدی هەر باسی ناكرێ ) ئەوان لەبەرامبەر كردەوەكانیاندا بە مەسئوول دەزانێ. لەئاكام دا ئەگەری زۆرە ئەوانە لە ژێر تەوژم یان لە ژێر ئەو تەوژمەی رەنگە لەسەریان بێ، كەسێكی لێهاتوو بن. بەڵام هیچ كام لەو شتانەی باسیان كرا لەبارەی دەنگدەرانی نەناسیاودا لە دیموكراسیی هابزیدا راست دەرناچن. لەبارەی ئەو فەرمانڕەوایانەی بەم شێوەیە هەڵ دەبژێردرێن، رەنگە رادەیەكی كەم لەوەی گوترا راست بێ. ئەو كەسانەی پلەی سیاسییان لە كورتخایەندا لە بەرامبەر كێشەكاندا لاوازە، وەزعی ئەوانە زیاتر وەك شازادەكانی لایەنگری رێبازی ماكیاڤلی دەچێ، كە بەردەوام ترسیان لەوە بوو رقەبەرایەتی ببێتە هۆی ئەوەی خەڵكێكی زۆر لەرێگەی وەعدو بەڵێنی هەڵخەڵەتێنەرانەدا لە دەنگدان بگێرنەوە. بۆیە ئەوانە زۆریان حەز لە بەرێوەبردنی هەڵوێستو بەرنامەی كورتخایەنە، بەتایبەتی ئەو بەرنامانەی قازانجی كاتییان هەیە ( با قازانجی بچووكیش بن ) و خەرجەكان ( با زۆریش قورس بن ) وەدرەنگی دەخەن. لەهەمان كاتدا ئەوانە تەمایەكی زۆریان بۆ پلان داڕشتنی درێژخایەنیش لە داهاتوودا هەیە. ئەم كارەش لە رێگەی زمانلووسیو ئۆگریی تایبەتیو رێك خراو ئەنجام دەدەن كە پلەو پایەو نانو ئاوێك وەك پاداش بۆ ئەوكاتەی ژیانی سیاسییان كۆتایی هاتوە دابین بكا. یان ئەوەكە دەتوانن شوێنێكی لەبار لە رێكخستنێكدا كەبەردەوام بە حكوومەتەوە بەستراوەتەوە، یان بەیارمەتیی ئەو ناوەندو نووسینگانەی ناكەونە بەر رەخنەوگلەییو گازندەی دەنگدەرانەوە، بدۆزنەوە.

دەتوانین بەوئاكامە بگەین لە دێموكراسییەكی هابزیدا نامەسئوولیەتییەكی هەوسار دامالڕاو روو دەداو ئەو كێشەیە كێشەیەكی باوە. تەنیا زۆربوونێكی چاوەڕوان نەكراوی تایبەتمەندییەكانی خۆپاراستن لەنێو دەنگدەرانو سیاسەتمەداران دایە دەتوانێ ئەم بۆچوونەی ئێمە تەعدیل بكا. هەرچۆنێك بێ، ئەگەر "دەوڵەتی بەرپرس" هەر ئاماژەیەكی ئیجابیی لە نێوەرۆكی دابێ، پێویستیی بە بەڵگەهێنانەوەی زیاتر بە مەبەستی بەرگری لەم بۆچوونە نیە كە دێموكراسیی هابزی لەریزی خراپترین شێوەكانی هەر دەوڵەتێكە تۆ بیری لێ دەكەیەوە.

## دێموکراسی، نوێنەرایەتیو ئەندێشەی دەستووری مەشرووع

نابێ لەبیرمان بچێ دیموکراسی ناوبانگی باشی خۆی لە شێوە مۆدێڕنەکانی دێموکراسیی هابزی وەرنەگرتوە. دیموکراسیی هابزی چەمکێکی بەتەواوی روون نیە. وەرن با چەمکە باوەکانی دیموکراسی کە "بایەخە دیموکراتیییەکان" لە ناخی خۆیان دا بەرهەم دێنن بخەینە لاوەو، و فکری خۆمان لەسەر ئەو چەمکانە خڕ بکەینەوە پێ لەسەر شێوە دیموکراتیکەکان( هەڵبژاردن، دەنگدان) بۆپڕکردنەوەی هێندێك پۆست یان گەیشتن بە هێندێك بڕیار لەنێوخۆی ڕێکخستنێك دا دەگرێ. لەنێو ئەمەی دواییدا چەمکەکانی دێموکراسی لە نێوان دوو جەمسەردا لە هەڵکشان داکشان دایە.

چەمکی ئەمڕۆیی دێموکراسی بێگومان ئیلهامی لە حەزو خۆزیاکانی سەدەکانی نۆزدەو بیست بە مەبەستی دابین کردنی "مافی دەنگدانی گشتی" وەرگرتوە. ئیزن بدەن ناوی بنێین" دێموکراسیی سیاسی". ئەم دیموکراسییە ئەغلەب لەسەر ئەو گومانە دامەزراوە  هەرچی مرۆڤێکی زیاتر لە بوارێکی تایبەتدا لە دەنگداندا بەشدار بن، لە ئاکامدا ئەو بڕیارەی بەم شێوەیە دەدرێ رەنگە زیاتر دێموکراتیك بێ. ئەگەر ئاکامی مەنتیقیی ئەمە وەبەرچاو بگرین، ئەو مانایەی دەبێ کە هەر کەسێك لەنێو ئەو ڕێکخستنەدا دەبێ بتوانێ بۆ هەر بابەتێك دەنگ بدا. لە دێموکراسییەکەی هابزیدا، ئەو کاتەی خەڵك بەروالەت دەسەڵاتی دانانی قانوونو بەرێوەبردنی سیاسەت لە هەر بوارێکدا دەدەنە دەسەڵاتدار، مافی دەنگی گشتی هەولێکە بۆ بەلگەدارکردنی دانی دەسەڵات بە خەڵك وەك مافێك بە مەبەستی بەشداری لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتدارداریە.

لەلایەکی دیکەوە چەمکی کۆنی دیموکراسی وەکوو دیفاعێکی نیهادینەکراو لە بەرامبەر ملهوڕیو سەرەرۆییشدا هەیە. ئێمە ناوی"دێموکراسیی قانوونی"ی لەسەر دادەنێین. بنەمای ئەندێشەکەی ئەوەیە خەڵك نابێ بۆ قازانجی تایبەتی مل بۆ دەسەڵاتو ڕێبەریی خەڵکی دیکە رابکێشن.

ئەم چەمکەی دیموکراسی پێوەندیی نزیکی نێوان گرووپێك لە بوارێکی تایبەتیدا خاوەنی مافی دەنگدانەو گرووپێکی دیکە کە رەنگە باجی بڕیارەکانی ئەو هەڵبژاردنە بدا ( بەو بڕیارانەی دەنگدەران بە دەنگی خۆیان وەدییان دێنن ) دەستەبەر دەکا. کەوابوو لە دوورە دیمەنی "دێموکراسیی قانوونی"دا ئەگەر ژمارەیەکی کەمتر لەو



خەڵکەی خاوەنی مافی دەنگدان نین بکەونە ژێر کاریگەریی هەڵبژاردنەوە، شێوە بڕیاردانێکی دێموکڕاتیك تر بەدی دەکرێ...

دیارە نابێ پێمان وابێ بیری مافی دەنگی گشتی پێوەندیی بەو ڕێژیمانەوە هەیە لەسەر بنەمای دێموکراسیی هابزی دامەزراون. لە راستیدا لەرووی مێژووییەوە وانەبووە. هەڵبژاردن لە حکوومەتی مۆدێڕندا وەك بەشێك لەشۆرش لەسەربنەمای دەستوور هاتە گۆڕێ کە ئامانجەکەی بریتی بوو لە نیهادینە کردنی حکوومەتی قانوونیو پارێزگاری لە ئازادیو عەدالەت، لە حالێکدا پاوانخوازیی حکوومەت وێڕای توندوتیژی هەر درێژەی دەبوو. بێگومان جگە لە ئارەزووی دۆزینەوەی جێگەیەك بۆ شا لەو سیستەمە نوێیەی لەسەر دەستوور دامەزراوە، هۆیەکی روونی دیکە نەبوو بۆچی کەسێك دەبێ بۆ بەرێوەبردنی قانوون ئەو دامودەزگایەی لە پاوان دابێ. بێگومان جێگەو کاتێکی ئەوتۆ لە حکوومەتی قانووندا بە بیری کەسدا نەدەهات. هەرچەند ریفۆرمی حکوومەت فریودانێکی ئاسانتر بوو تا ئەوەی تەنیا تۆڕێك لە ڕێکخستنی بەرگری لەخۆکردن لە جیاتی ئەمەبێ. تەنانەت ئەگەر لە پاواننانی بەرێوەبردنی قانوون ئەم پرسیارە حاشاهەڵنەگرەی"کێ دەبێ لە بەرامبەر پارێزەرانی ئێمەدا، پارێزگاری لە ئێمە بکا؟ "هێنابایە گۆڕێ. وەڵامی سادە بەڵام کاڵو کرچ بەمە، بریتی بوو  لە هەبوونی پارلمانێك کە لە نوێنەران پێك هاتوەو دەڵێ لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێرێو لە بەرێوەبردنی قانووندا پێشی هەڵەی دەسەڵاتی بەرێوەبەریی دەوڵەت لە بەزاندنی سنوورەکانی چالاکییە مەشرووعەکان بگرێ. بەمەبەستی گەیشتن بەو شتە، دەبووا نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خەڵك قانوونگەلێکی مەشرووع پەسند بکەن تا حکوومەتو کاربەدەستان ناچار بکا گوێ بدەنە حکوومەتی قانوونو ڕێزی لێبگرن. ئەوەکە نوێنەرانی خەڵك یان ئەوانەی نوێنەریان بوون دەبووا چۆن توانیبایان لەبەرامبەر دەوڵەتێکی سەرەرۆو دەسەڵاتخوازدا قانوون بەکار بێنن، گرنگییەکی بەپەلە نەبوو. ئەوان هیوایان بەوە بوو، بوونی نوێنەرانی هەڵبژێراوی خەڵك ئەوانەی هەڵسوکەوتی دەوڵەت دەخەنە ژێر چاوەدێری، بۆخۆی دەستەبەرێکی تەواوە. هەرچۆنێك بێ هەڵبژاردنی نوێنەران بوو بە مەسەلەی سەرەکی لە ئیستیدلالەکاندا بۆ دەستوورێکی مەشرووع.

کەوابوو ئەرکی نوێنەرانی خەڵك ئەوەبوو دەسەڵاتی بەرێوەبردن بخەنە ژێرچاوەدێری تاکوو لە دەستدرێژکردنەسەر یان کەم کردنەوەی مافە قانوونییەکانی فەردیو کۆمەڵایەتی کەڵك لە دەسەڵاتی

خۆی وەرنەگرێ. نوێنەران دەبووا ئەم کارەی لەرێگەی کردەوەی قانووندانانەوە بکەن کە نەك خەڵك بەڵکوو تەنیا "بەرپرسانی بەرێوەبەر" بۆ بەرێوەبردنی ئەرکەکانیان بە گوێرەی دەستوور ناچارو بەرعۆدە بکەن ــ بەتایبەتی لەبارەی پاراستنی قانوونو بەرگریی هێرشەکانی دەرەوەدا. بەکورتی ئەرکی سەرەکیی نوێنەران خاترجەم بوون لەوە بوو کە نە فەرمانڕەوایەك هەبێو لە ئاکامدا نە ژێر فەرمانێك.

کاکڵی دەستوورێکی قانوونی هەر ئەمەیە. نوێنەران تەنیا نوێنەرن نەك دەسەڵاتدار بە دەسەڵاتی شەخسییەوە یان پشتیوانو خزمەتکاری دەسەڵاتدار، ئەوانە نوێنەرانێکن نابێ بتوانن فەرمانڕەوایی بەسەر ئەو خەڵکەدا بکەن کە هەڵیان بژاردوون. لە راستیدا بیری دەستوورێکی قانوونی لەسەر ئەو گومانە دامەزرابوو کە خەڵك بۆخۆیان باڵغنو پێویستیان بە کەسێکی دیکە نیە فەرمانڕەواییان بەسەرگیانوماڵیاندا بکا. بە مەبەستی پێوەندیو هاوکاریی دوولایەنەیان حکوومەتی قانوون بەسە ــ دیارە حکوومەتی قانوون هەر ئەو حکوومەتەی قانوون دانەران نیە، چ قانوون دانەرانی هەڵبژێراوو چ هەڵنەبژێراو. لە ئاکام دا سەرەکیترین پێویستیی دەستووری قانوونی ئەوەیە نوێنەرانی خەڵك بە پێی رێوشوێنی قانوونی دەسەڵاتی ئەوەیان نەبێ گیانو ماڵی خەڵك بخەنە ژێر دەسەڵاتی رێژیمەوە . تەنیا ئەو کاتە رێگەیان پێدەدرێ وەك "هاووڵاتێك" هەڵسوکەوت بکەن ــ بۆنموونە وەك دەنگدەر نوێنەر یان کاربەدەستێکی دەسەڵات ــ رۆڵو ئەرکەکانیان لەگەڵ پێناسەی قانوون دەگونجێ.

نوێنەرایەتی پێوەندییەکی سێ لایەنەیە: أ ( نوێنەر) نوێنەرایەتیی ب (دەنگدەر) لە بەرامبەر پ ( لایەنی سێیەم) دا دەکا، لە حاڵێکدا هەر کام لەوانە (أ، ب، پ ) کەسانێکی لێك جیان. لەم شێوەیە تەواو خالیسو تیئۆرییەدا، نوێنەر ناتوانێ ئەوەی نوێنەرایەتیی دەکا بە بێ ڕەزامەندیی وی لە بەرامبەر هەر ریککەوتنێك لەگەڵ لایەنی سێیەمدا بەرعۆدەی بکا. لە مێژووی سیاسیدا، سەرەتای کاری نوێنەری چینەکان ( بە تایبەتی رووحانیو شارنشینەکان ) لەسەر ئەم بنەمایە بوو. ئەمانە لە ئەنجوومەنێکدا کە لە لایەن شاوە بانگ دەکرا، نوێنەرایەتیی چینە دیاریکراوەکانیان دەکرد. بەڵام نەیان دەتوانی لەبەرعۆدەکردنی ئەوانەی نوێنەرایەتیان دەکردن لە گەڵ شا رێك بکەون.

کاتێك شا رای گەیاند تەنیا ئەو کاتە لەگەڵ نوێنەرایەتییەك وتووێژ دەکا خاوەنی دەسەڵاتی تەواو لە بڕیاردان دابن، ئەو پێوەندییە تووشی گەندەڵی دەبوو. چونکە رازی بوونی ئەوەی



نوێنەرایەتیی دەکرێ لە هەر وتووێژیكو رێککەوتنێك لە نێوان (Plena POTESTAS) نوێنەرو شا دا بەرواڵەت لە هەڵبژاردنی نوێنەردا لە لایەن هەڵبژێرەوە هەبوو. بیری نوێنەرایەتی تەنانەت ئەو کاتە زیاتر تووشی گەندەڵی بوو کە پاشاکان لە گۆڕینی ئەرکی نوێنەرایەتیی تاك تاك بە نوێنەرایەتیی پارلمانیی نوێنەراندا بە مەرامی خۆیان گەیشتن. بەم جۆرە رەزامەندیی زۆربەی نوێنەران بۆ بەرعۆدەکردنی هەموو نوێنەرانو هەموو خەڵکێك کە ئەوان نوێنەرایەتیان دەکردن، بەس بوو.

نوێنەرانو شا لەراستیدا بوونە فەرمانڕەوای ئەو خەڵکەی لە لایەن نوێنەرانیانەوە نوێنەرایەتی دەکران. کێشەی نێوان شاو نوێنەران بووبە هۆی لە مەیدان دەرکردنی نوێنەرانر( پاشایەتیی موتلەق) یان وەلانانی شا ( حکوومەتی پارلمانیی موتلەق) دیارە ئەگەر لایەنی سەرکەوتوو دەسەڵاتی هەبووایە. لە گەڵ هەموو ئەمانەدا بیری دەسەڵاتی سنووردار لەسەر ئەو بنەمایە بوو کە نوێنەرانر( Plenitudo Potestasis )ی بێسنوور تەنیا دەتوانێ لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتەی دا پێی دراوە، بجووڵێتەوە.

ئەو سنوورانە هەورازتر دەچوون. بەومانایە کە فەرمانڕەواکان دەیان توانی خۆلە هەر ( plenitude potestasis ) دەسەڵاتی بێسنووری بابەتێك بدەن کەبەکردەوە لە سنوورەکانی دەستوور یان بیروباوەڕی ئایینیو ئەخلاقیی هاوبەش نەدەچووە دەر. بەواتایەکی دیکە دەسەڵاتداران مافی ئەنجامدانی هەرکارێکیان بە شێوەی تایبەت تەنیا بۆخۆیان بەرەوا دەزانی کە بەئاشکراو بەروونی لێیان مەمنووع نەکرابوو. لەجیاتی دەسەڵاتە ئەسپێردراوەکان (نوێنەرایەتی)و لەپێشدا دیاریکراوەکاندا، ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە دەجووڵانەوە کە وەك فەرمانڕوایەکی موتلەق دەتوانن بۆ خەڵکی خۆیان بەهەر شێوەیەك پێیان خۆش بێ قانوون دابنێنن ( یان قانوونێك کە خەڵکەکەیان بتوانن پێی رازی بن ) .

بۆیە پێوەندیی سێ لایەنەی نوێنەرایەتیی رەسەن بوو بە پێوەندییەکی دوولایەنە قەڵبو درۆزنانە. واتە لە پەنا " دەسەڵاتی تەواو بۆ بڕیاردان"و" دەسەڵاتی بێ سنوور" دا کە هەمان تایبەتمەندیی واقعیی حکوومەتی دیکتاتۆڕن: ( أ ) لەبەرامبەر ( أ ) دا کە خۆیەتی، نوێنەرایەتیی ( ب ) دەکا . هەروەك دیتمان تیئۆریی هابزی هەڵگری ئەو بیرەیە کە شا بۆخۆی نوێنەری خەڵك لە بەرامبەر شا دایە. گەندەڵیی بیری دەستوور وەدیهێنانی لە حکوومەتە ئورووپاییەکاندا بە شێوەیەکی وێکچوو پێویستیی بەوەبوو نوێنەرانی خەڵك، لە بەرامبەر

نوێنەرانی خەڵکدا نوێنەرایەتیی خەڵك بکەن. ئەمە هەمان توانجە بەناوبانگەکەی رۆسۆیە لە بەرامبەر "ئازادیی بریتانیا"دا. لە راستیدا " نوێنەرایەتیی ( أ ) لەلایەن ( ب ) " وە لەم شێوە دوولایەنیەیدا تەنیا قسەیەکی جوانە بۆ ئەم رستەیە" ( ب )حکوومەت بەسەر ( أ ) دا دەکا".

کاتێك وەك پرەنسیپەکان بڕیاردانی نوێنەرایەتی "پارلمان بە زۆربەی دەنگ بڕیار دەدا" جێی" هەر نوێنەرێکی هەڵبژێراو لە پارلماندا بۆ دەنگدەرەکانی بڕیار دەدا" دەگرێتەوە، کۆنترۆڵی بلۆکەکانی دەنگدان لە پارلماندا گرنگییەکی لە رادەبەدەری دەبێ. بەم جۆرە سەروسەکوتی دەستەبازی، چەند قۆڵی‌و رەنگە حیزبە سیاسییەکان بۆ پێکهێنان یان کۆتایی هێنان بە ئیئتیلافەکان‌و بەدەستەوەگرتنی کۆنترۆڵی ئەنجومەنی نوێنەران، دەردەکەوێ.

لە سیستەمێکدا لەسەر بنەمای دەستووری رەسەن زۆر گرنگ نیە داخوا بۆ نوێنەرایەتیی خەڵك حیزبێك هەیە یان هەر حیزبێك لەگۆڕێدا نیە یان ئەوەکە دوو یان چەند حیزب هەن. هۆیەکەی ئەوەیە هەڵبژێراوان ناتوانن ئەو خەڵکەی ئەوان نوێنەرایەتیان دەکەن بەرعۆدەیان بکەن. تەنیا لە بەرامبەر دەسەڵاتی بەڕێوەبردندا یان دەسەڵاتێك کە دەبێ قانوون بەڕێوەبەرێ‌و لە بەرامبەر ئەمانەدایە کە نوێنەرایەتییەکەیان ماناو نێوەرۆکی هەیە. لە ئەنجومەنی نوێنەراندا حەوجێ بە ئیئتیلافێکی جێگیرو بەردەوام نیە، پارلمانێك کە ئەنجومەنی راوێژکاری هەیە، لەو ئەنجومەنەدا هەموو ئەندامان بە گوێرەی دەستوور لە بارەی کاری وەك یەك بۆ پارێزگاری لە حکوومەتی قانوون لە بەرامبەر خراپ کەڵك وەرگرتن و زیاد پێ راکێشانەکانی بەرپرسانی بەڕێوەبردندا بەرعۆدەن.

لەرێژیمێکی ئەوتۆدا لەسەربنەمای دەستوور، مافی دەنگدانی گشتی‌و بوونی حیزبە جۆراوجۆرەکان رەنگە باشترین دەستەبەر بۆ دڵنیابوون لەوەیە کە پارلمانی نوێنەرانی هەڵبژێراو، بەورادەیە هەڵبژێراوی خەڵکن کە بەکردەوە هەن. بۆیە دێموکراسی ــ وەکوو ئامرازێکی قانوونی بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی واقعی ــ وێ دەچێ شتێکی زۆر باش بێ لە پێناوی پارێزگاریی کاریگەر لە حکوومەتی قانوون‌و ماف و ئازادییەکانی خەڵك. هەرچەند ئەو پرەنسیپەی نوێنەرایەتی" دیموکراتیك" لەگەڵ دێموکراسیی هابزی کە ئەمڕۆ لە وڵاتانی ئێمەدا حاکمە تۆزقاڵێك وەك یەك ناچن.



# دیموکراسی‌و پەرەگرتنی NGO یەکان لە ئورووپای ناوەندی‌و رۆژهەڵاتدا

ن: **Ginta T. palubinskas**

## ئورووپای ناوەندی‌و رۆژهەڵات لە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت دا:

بە دامەزرانی کۆمۆنیزم لە ئورووپای ناوەندی‌و رۆژهەڵاتدا پێکهاتەی ئابووری، سیاسی‌و کۆمەڵایەتی لە ناوچەکە گۆڕانی بەسەردا هات. لە ژێر سێبەری ئەم گۆڕانەدا تەقریبەن هەموو رێکخراوە نادەوڵەتییەکان لەنێو چوون. دەزانین لە سیستەمە کۆمۆنیستییەکاندا چالاکییە سیاسی، ئابووری‌و کۆمەڵایەتییەکان لە لایەن حکوومەتە دیکتاتۆرەکانەوە کە بە هۆی تاقمێکەوە هەڵ دەسووڕێن، کۆنترۆڵ دەکرێن. ئەم سیستەمە نوێیە هێندێك قانوونی بەسەر کۆمەڵدا زاڵ کرد کە هیچ چەشنە بەشداری یان پێشوازییەکی گشتیی تێدا نەبوو. لە کەشوهەوایەکی ئەوتۆدا ئەو کەسانەی خاوەنی دەنگ‌و ئەندێشەی سەربەخۆ لە بواری کۆمەڵایەتی دابوون لە مەیدان وەدەر دەنران. لە ژێر سێبەری سیستەمێکی ئەوتۆدا شتێك بە ناوی ژیانی تایبەتی، نەبوو. چونکە دەوڵەت خەڵکی هان دەدا دراوسێ، دۆست‌و ئەندامانی بنەماڵەشیان بخەنە ژێر چاوەدێرییەوەو راپۆرت لە بارەی هەڵسوکەوتیانەوە بدەن. هەربۆیە متمانەی گشتی لە نێو چووبوو، وتووێژی خەڵك کۆنترۆڵی لەسەر بووو تەواوی ئەنجومەن‌و کۆڕو کۆمەڵەکان هەڵ وەشابوونەوە.

نەبوونی هاوسەنگیی هێز کە بە هۆی ترس لە سیاسەتەکانی سۆڤیەتەوە سەرچاوەی گرتبوو، و لە بوارەکانی ئابووری، سیاسی‌و کۆمەڵایەتییەوە ریشەی داکوتابوو، پەرەی بە

فەسادو چەوسانەوە لەو سیستەمە تازەیەدا دەدا. ئەم مەسەلەیە کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر پێکهاتەی سیاسی، ئابووریو کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتو چۆنیەتیی پێشکەوتنی سەرمایە کۆمەڵایەتییەکان هەبوو . چونکە ئەم دەوڵەتانە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیان دادەمەزراندو کۆنترۆڵیان دەکردنو ئەمانەیان بۆ پەروەردە کردنی حیزبیو کۆنترۆڵی کۆمەڵ بەکار دەهێنا.

کۆمەڵگەی سۆڤیەت لە ڕاستیدا یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی ناسروشتی بوو، کۆمەڵگەیەکی گەڵاڵە بۆ دارێژراو و خاوەنی ئامانجو هەمیشە وشیارو ئاڵۆز بوو. هەر کام لە سیستەمەکان کۆپییەکی واقعی لە سیستەمی ناوەندی بوو و هەر کام لە ئەندامەکانی لە ژێر چاوەدێریی بەرپرسانی سەرەوەدا بوو. لەم سیستەمەدا سەرمایەکانو ڕێکخراوەکان هەموویان دەوڵەتی بوون.

ئەو کەسانەی لە ژێر سایەی ئەم سیستەمەدا دەژیان و زانیاریان لە بارەی پێکهاتەی ئابووری، کۆمەڵایەتیو سیاسیدا نەبوو، یان زانیاریان زۆر کەم بوو و ئەوە کە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی یان ئابووری چۆن بە خەڵك بسپێردری، لە لایەن دەوڵەتەوە دیاری دەکرا.

## کەشوهەوای کراوەی سیاسیو پەرەگرتنی NGO یەکان لە ئورووپای ناوەندی ڕۆژهەڵات دا

هەڵوەشانی کۆمۆنیزم لە ئورووپای ناوەندیو ڕۆژهەڵات کەشوهەوایەکەی لە کۆتو بەندی پەنجا ساڵەی یەکیەتی سۆڤیەت ڕزگار کردو وڵاتەکانی لەگەڵ سیستەمی ئابووریی بازاڕی ئازاد ئاشنا کرد. چوارچێوەیەکی قانوونیی بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگە دێموکراتیکەکان پێك هاتو پێکهاتەی قانوونو ڕێکخراوەکان ئاڵوگۆڕیان بەسەر داهاتو زۆری پیٚ نەچوو نیشانە بنەڕەتیو سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی دیموکراتیك واتە مافی هاتوچۆ و کۆبوونەوە، ئازادیی کۆمەڵایەتییەکان، بوونی گرووپە جۆراوجۆرە سیاسییەکان، ئازادیی هەڵبژاردنو دەستاودەستکردنی ئاشتیخوازانەی دەسەڵات لەم وڵاتانە دا پێشوازیی لیٚ کرا.



ئەو ئاڵوگۆڕانەی لە قانوونو ڕێکخراوەکاندا پێك‌هات هێندێك لەو پێکهاتانەی پێشوو و ئەو شێوە پێوەندییەی لە سیستەمی حکوومەتیی سۆڤیەتدا هەبوو، گۆڕی. سیستەمی فرەگرووپی جێگەی سیستەمی تاقانە گرووپیی گرتەوەو هاووڵاتان جارێکی دیکە مافی بەشداری، ئازادیی تێکۆشانو قانووندانانیان وەدەست هێنایەوە. بەڵام ئەم ئاڵوگۆڕانە نەبوونە هۆی ئەوەی وڵاتانی ناوەندو ڕۆژهەڵاتی ئورووپا کە پێڕەویان لە یەکیەتیی سۆڤیەت دەکرد ببنە لایەنگری دیموکراسی. هەرچەند زۆربەی ئەم وڵاتانە بەرەو دیموکراسی چوون و ڕێکخراو و نیهادە دیموکراتیکەکان بە ڕەسمی سەریان هەڵ دا بەڵام ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ گیانی دێموکراسیان لە دەست دا.

بێگومان پەڕینەوە لە سیستەمێکی دیکتاتۆری بۆ سیستەمێکی دیموکراسی پێویستیی بە ڕێکخراوە نادەوڵەتییەکانە.

## NGO یەکان سیٚ ڕۆڵی سەرەکی لە دێموکراسیدا یاری دەکەن:

١- بیرو باوەڕە گشتییەکان دەکەن بە سیاسەتێکی گشتی لەسەر بنەمای قانوون،

٢- سیاسەتێکی گشتی لەسەر بنەمای بیروبۆچوونی گشتی پێشنیار دەکەنو دەیکەن بە ئامرازێك بۆ بەڕێوە بردنی سیاسەت،

٣- خزمەتەکانی خۆیان جیا لە نیهادەکانی دیکە پێشکێش دەکەن.

پاش هەڵوەشانی کۆمونیزم لە ئورووپای ناوەندیو ڕۆژهەڵات، پێویستی بە NGOیەکان نیشانەی گۆڕانی هاوکێشیی هێز بوو. واتە پەڕینەوە لە حکوومەتی تاکحیزبی بەرەو کەشوهەوای ئازاد لە جۆری ئەو دەوڵەتەی کە، NGOیەکان لە جیاتی ئەوەی ببنە نیهادیکی سەربەخۆو واقعی پێوەندییەکی زۆر نزیکیان لەگەڵ دەوڵەت هەبوو. زۆر لە دەوڵەتانی ئورووپای ناوەندیو ڕۆژهەڵات ( وکوو: ڕۆمانی، پۆلۆنیا، هەنگاریاو لیتوانی ) هەوڵیان دەدا قانوونێکی باشو چوارچێوەیەکی نیهادی بۆ NGOیەکان پێك بێنن. بەڵام لەسەرەتادا وادیار بوو پێداگرتنێکی بێجێیان لە سەر هاوکاری و بەشداریی بەشی نادەوڵەتی( NGO ) و دەوڵەت دەکرد. واتە NGOیەکان بە بودجەی دەوڵەت یارمەتیی ماڵی بدرێنو دەوڵەت بە ڕادەیەکی زۆر چاوەدێری بەسەر کارەکانیاندا بکا.

بیگومان ئەم بارودۆخە لە سیستەمی داسەپاوی سۆڤیەتدا بە هیچ جۆر شتێکی سەیر نەبوو. لە سیستەمی سۆڤیەتدا یارمەتییە دەوڵەتییەکان وەك ئامرازێك لە هەموو بوارە رەسمیو کۆمەڵایەتییەکاندا بەکار دەهێنرا. هەروەها لەو یارمەتیانە بە مەبەستی وەلانانی هەموو ئەو دیاردانە کە ئیزنی دەوڵەتیان لەسەر نیە کەڵکیان لیَ وەردەگیرا.

سیستەمی سۆڤیەت هەر چەشنە داهێنانێك یان تاقیکردنەوەیەکی بۆ ئەزموون لیَوەرگرتن و سەربەخۆیی لە بیرکردنەوەدا سەرکوت دەکرد. چاپلووسیو بابنۆکەریو بیَئیرادەیی لە نێو هاوولاّتان دا پەرەی پیَ درابوو، بەلاّم ئەم جار هەلّوەشانی کۆمۆنیزم لە ئورووپای رۆژهەلاّتو ناوەندیدا ببوو بە هۆی ئالّۆزی لە کۆمەلّگەدا. بە هەلّوەشانی سۆڤیەت، بە روالّەت نفووزی فەرهەنگیی سۆڤیەت لە نێو چووبوو، بەلاّم هەروەك چاوەروان دەکرا بەستراوەیی بەم رێژیمە هەروا درێژەی کێشا و ئەو ئیمتیازە حقووقیانەی سیستەمی سۆڤیەت پیَکی هێنابوون، هەروا بە دەستلێنەدراوی مانەوە. ئەوکەسانەی پیَشتر سەربە دەوڵەت بوون هەروا پشتیوانیان لە دەوڵەت دەکردو سەرەنجام پاش ئەوەی NGOیەکان رەگەلّ دەوڵەت کەوتن، هەردوو لا بیمە بوون. لە راستیدا دەوڵەت بە شێوەیەکی کاریگەر کۆنترۆڵی بە دەستەوە گرت. NGOیەکانیش سەبارەت بەوەی لەلایەن دەڵەتەوە پشتیوانیان لیَ دەکرا هەستیان بە ئەمنییەت دەکرد. ئەم بەستراوەیە بووو بە هۆی شل بوونەوەی پیَشکەوتنی دێموکراسی لەو کۆمەلّگەیانەدا کە پیَشتر سیستەمی کۆمۆنیستیان بەسەر دا زالّ بوو. لە حالیَکدا لە هێندێك لە ولاّتانی کۆمۆنیستیی پیَشوودا کە NGOیەکان گەشەیان کرد، بوونیان یارمەتیی بە پرۆسەی دیموکراسی کرد. ئەو ولاّتانەی پشتیوانیان لە گەشە کردنی NGOیەکان دەکرد، لە چاو سەدەیەك پیَشتر کارێکی زۆریان بە مەبەستی دیموکراتیك کردنی کۆمەلّگەی خۆیان لە ماوەیەکی کورتدا ئەنجام دا. بەلاّم ئەو ولاّتانەی لە بەرەی کۆمۆنیزمدا NGOیەکانیان بەپیَی قانوون قەدەغە کردبوو لە پرۆسەی گەیشتن بە کۆمەلّگەیەکی دێموکراتیکدا پیَشکەوتنێکی کەمیان وەدەست هێنا. هەلّسەنگاندنی پرۆسەی دیموکراسی نیشان دەدا لیتوانی، لیتوونی، ئیستوونی، چیَك، هەنگاریا، پۆلۆنیاو سلۆڤاکی لە ریزی ٣٤ ولاّتی ئازادی جیهان دان. بەلاّم بولگاریاو رۆمانیا زۆر لە دیموکراسی دوورن. دیموکراسی لە ولاّتانی سەربەخۆی هاوسوودیش دا پیَشکەوتنێکی ئەوتۆی نەبووە. لەنێو



١١ ولاّت دا کە هەلّسەنگێندراون، رووسیە لە خوارەوەی ریزی ولاّتانی ئورووپای ناوەندیو رۆژهەلاّتدایە بەلاّم لە سەرەوەی حەوت ولاّتی پیَشووی سۆڤیەتدایە ( ئازەربایجان، بیلۆرووس، قەزاقستان، قرقیزستان، تاجیکستان، تورکمەنستان، ئۆکرانیاو ئوزبەکستان) . مولداڤیاش یەکێك لە ولاّتانی هاوسوودە کە لە ولاّتانی ئازاد دوورە.

## بەهێز کردنی NGOیەکان لە ئورووپای رۆژهەلاّتو ناوەندی دا

گەشەکردن لە چوارچێوەی قانوونیو حقووقیدا بۆ بەشە نادەوڵەتییەکان لە ولاّتانی کۆمۆنیستیی ئورووپای ناوەندیو رۆژهەلاّتدا وەك هەنگاوێکی گرنگ لە پەرەگرتنی کەشوهەوایەکی لەبار بەمەبەستی تایبەتی کردنو گەشەکردنی بەشی نادەوڵەتی و غەیرە بازرگانی یان بەشی سێهەمدا سەیری دەکریَ. گرتنە بەری ئەو سیاسەتانەی بە تایبەتی بە مەبەستی سڕینەوەی شوێنەوارەکانی سۆڤیەت لە بواری وەکوو زمانلووسی، بابنۆکەریو لارەملی دا هەروەها بەڕێوەبردنی سیاسەتێکی وا کە دەسەلاّت بە خەلّکی بسپیَریَو هەروەها هاوکاریو هاورێیەتیی بەرچاو و متمانەبەخشی هاوولاّتان و دەوڵەت گرنگیەکی زۆری هەیە. Koestenbaum ( ١٩٩١ ) فۆرمۆلێکی سادەی بۆ پیَکهێنانی دەسەلاّت وەدەست هێناو تیَگەیشت کە ئیختیارو دەسەلاّت بریتین لە، خودموختاری، لایەنگری و پشتیوانی لێکران:

$$E=A+D+S$$

**E: ئیختیارو دەسەلاّت**

**A: خودموختاری**

**D: لایەنگری**

**S: پشتیوانی لێکران**

بۆ ئەوەی خودموختاری زیاد بکریَ، دەبیَ دەوڵەتانی ئورووپای ناوەندیو رۆژهەلاّت قامك لەسەر ئەو بەرنامانە دابنێن کە بوار بە دەسەلاّتی هاوولاّتان بدا نەك هەولّ بدەن بە دامەزراندنیNGOیەکان یارمەتی بە دەسەلاّتی دەوڵەت بدەن. دەوڵەتەکان دەبیَ

زیاتر له هەر شتێکی دیکه به پێکهێنانی هاندەرە ماڵیاتییەکان ڕێگه بۆ دەزمایەدانانی دیاریکراو خۆش بکەن، دەزمایەدانانێك ئامانجەکەی بریتی بێ له پشتیوانیی ماڵیی NGOیەکان. کەم کردنەوەی ماڵیات لەسەر داهاتی ئەوکەسانەی له ڕێی خەڵکدا کار دەکەن مانای ئەوەیە کە دەوڵەت ڕێز له هەڵبژاردنی کەسیی هاووڵاتان دەگرێ و ئەوان هان دەدا بۆ کاری مرۆڤدۆستانە. دەوڵەت ڕێگە بە خەڵك دەدا تاکوو ڕێژەیەك له ماڵیاتەکانیان بدەنە NGOیەکان و ببێتە هۆی سوودگەیاندن بە هاووڵاتان...سەرەنجام دەبێ دەوڵەت پشتیوانی له بەشی سێهەم بکا له ڕێگەی لێخۆشبوونی ماڵیات بۆ NGOیەکان به تایبەتی ڕێکخراوە سوود گەیەنە گشتییەکان.

## بەکورتی

هەڵسوکەوتی ڕێکخراوەیی له ئورووپای ناوەندیو ڕۆژهەڵاتدا هەروا لەژێر فشاری سیاسەتەکانی دەوڵەت دایە. کاتێك بەشی دەوڵەتی بچووك بکرێتەوە، کەشوهەوا بۆ ڕێکخستنی بەشی نادەوڵەتی پەرە دەگرێ. حکوومەتەکان له وڵاتانی ئورووپای ناوەندیو ڕۆژهەڵاتدا بە خۆتێهەڵنەقوتاندن له بەشی سێیەم ( چوارچێوەی تێکۆشانیNGOیەکان ) خۆگونجاندنێك لەگەڵ دۆخە تایبەتیو گەشەکردنو هەڵدانی دەزگا نادەوڵەتییەکان پێك دێنن. NGOیەکان هەر ئەوانەن کە بەشی سێیەمی واقعی پێك دێنن: بەشێکی زیندوو کە دەکەوێتە نێوان بەشی دەوڵەتیو بازرگانییەوە، بەشداریی هاووڵاتان لە دیموکراسیدا روو له زیاد بوونە. ئەمڕۆ NGOیەکان ئازادن تا بۆچوونی تاکەکان بگەیەننە بەرنامە دارێژەرانی دەوڵەت بە شێوەیەکی سەربەخۆ خزمەتو سەرمایەکانیان پێشکێش بە هاووڵاتان بکەن. لەسەریەك دەتوانین بڵێین دیموکراسی لە ئورووپای ناوەندیو ڕۆژهەڵاتدا لە حاڵی پەرەگرتن دایە.

**سەرچاوە:**

**اطلاعات سیاسی اقتصادی ۱۱۹ـ ۱۲۰**



# گوڵی مێخەك لە لوولەی چەکدا

سێ دەیە لەوە پێش لە پورتوگال سوپا یەکێك لە کۆنترین دیکتاتۆرەکانی ڕۆژئاوای رووخاند. ئەم رووداوە سەرەتایەکی نوێ بوو کە ئازادیی بۆ تەواوی ئورووپا بە دیاری هێنا.

خاڵی دەست پێکردنی ڕاپەڕین شێعرێکی کورتی دڵداریی پائۆلۆ دیکارڤاڵهۆ بوو.کاتژمێر دە و پەنجا دەقەی ٢٤ی ئەپریلی ١٩٧٤ له ڕێگەی رادیۆوە:" دەمەویست بزانم من کێم/ لێرە چ دەکەم/ کێ منی بە جێ هێشتوە/ کێم لە بیر چووە/ تۆ بە بەرگی سەرتاپابەخوار له گوڵ هاتی/ من گەڵاکانتم سڕینەوە/ تۆ خۆت تەسلیمی خۆشەویستی کرد/ بەڵام من هیچم پێ نەدای..." ئەمە نیشانەیەکە بۆ دەست پێکردنی عەمەلیاتی نیزامی. بەڵام گۆرانیی کارڤاڵهۆ له ژێر ناوی ( پاش ماڵاوایی )دا لە مێژوو دا تۆمار ناکرێ, شێعرێکی بەناوبانگی زەکا ئالفۆنسۆ لە ژێرناوی ( گراندۆلا ئەم شارە سووتاوە )دا لە شارێکی بچووکی کشتوکاڵی له سەد کیلۆمەتریی باشووری لیسبوون جێگەی ئەو دەگرێتەوە, ئەو جێگەیەی کە شەقامە قوڕاوییەکانی وەك روخساری کرێکارەکانی کشتوکاڵی ئەو شارە بۆتە رەنگێکی قاوەیی تۆخ. دەنگی ئەم گۆرانییە نیو کاتژمێر دوای نیوە شەو بەرز دەبێتەوە, هەر وەك پەیامێك بە رەمز هاتبێ و بڵێ" ڕاپەڕین دەستی پێکردوە" گۆرانییەکەی ئالفۆنسۆ کە ئاهەنگەکەی تێکەڵ بە زایەڵەی هەنگاوەکانی خەڵك دەبوو بەم جۆرە بوو:"له نێو تۆ دا ئەی شارەکەم/ خەڵکە حکوومەت دەکا/ ئەی وڵاتی برایەتی/ لە هەر گۆشەیەکیدا روخساری خۆشەویستی هاوڕێیەك...". دوو ساڵ بەر لەو ڕاپەڕینە بوو پۆلیسی نهێنیی ترسناك تەواوی کاسێتەکانی ئەم گۆرانییەی لە بازاڕ کۆکردەوەو دەستی بەسەر داگرت. گۆیا پەیامە سیاسییەکەی لە رادە بەدەر روون بووە. یەکسانی و برایەتی ئێستاش پاش تێپەڕینی

١٥٠ ساڵ لە شۆرشی فەڕانسە لە پورتوگال دا وەك دروشمێكی مەترسیدار سەیری دەكرا, واتە لە بەتەمەنترین دیكتاتۆریی ئورووپای رۆژئاوا دا.

شۆرشی ٢٥ی ئەپریلی ١٩٧٤ كە بە " شۆرشی گوڵە مێخەكەكان" ناوبانگی دەر كردوە, سەرەنجام كۆتایی بەو دیكتاتۆرییە هێنا. بەڵام ئەم شۆرشە ئەمرۆ بۆ ئێمە نیشانەی سەرەتای شەپۆلێكی گەورەی دێموكراسیخوازی لە ئورووپاو نوێكردنەوە بنەڕەتییەكەی كە لە باشوورەوە دەستی پێ‌كرد ( رووخانی رێژیمی ئۆبرێستەكان لە یۆنان لە ١٩٧٤ دا وكۆتایی بە فرانكۆئیزم لە ئیسپانیا لە ١٩٧٥ دا ) و بە دەستپێكردنی دەیەی هەشتا ولاتانی بلووكی رۆژهەلاتی پێشووشی گرتەوە: لە ١٩٨٠ دا دانسیگ سەندیكای ئازادی سۆلیۆڤارنۆسك بە رەسمی ئیجازەی تێكۆشانی پێ‌درا و دوورە دیمەنی كۆتایی سیستەم پاش شەڕ خۆی دەر خست.

دیكتاتۆری لە پورتوگاڵ لە ١٩٢٥دا دەستی پێ‌كردبوو. كاتێك ژەنڕاڵ ڤیتۆر گومز داكوستا دەولەتی دیموكراتی رووخاند, دەولەتێك كە پاش نەمانی پاشایەتی لە ١٩١٠ دا هاتبووە سەركار، لە ١٩٢٣دا نیزامییەكان ئانتۆنیۆ سالازاریان وەك سەرۆك وەزیران هەڵ بژارد. تا ساڵی ١٩٦٨ كە ساڵی رووخانی بوو بە توندو تیژی و دیكتاتۆرییەوە بە سەر پورتوگال دا حكوومەتی كرد. دیارە رووخانی وی رووخانێكی بە مانای واقعیی وشە بوو: پارچەی رووپۆشی كورسییەكەی دڕاو دەسەلاتداری ٧٩ ساڵە وا كەوتە سەر عەرز كە تووشی خوێنڕێژیی مێشك بوو. پاش عەمەلیاتی نەشتەرگەری جەڵتەیەكلە ماوەی ساڵەكانی دوایی ژیانیدا واتە بۆ ماوەی دوو ساڵ نەقوستانی كرد. جێنشینی سالازار واتە ماچیلۆ كائیاتۆ رواڵەتێكی ئازادیخوازانەی بەخۆوە گرتبوو. بەڵام ئەو لە نیهایەتدا تەنیا درێژەدەری رێژیمەكانی پێشتر بوو. دیارە ئەوكات ئیدی رێكخراوە سیاسییەكان ئیجازەی تێكۆشانیان هەبوو. بەڵام باسێك لە تێكۆسانی حیزبەكان نەبوو. هەڵبژاردنیش هەبوو, كە دیارە دەولەت بە دەست تێوەردانیان كەندو كۆسپی بۆ پێك دێنان و پۆلیسی ترسناكی نهێنی هێشتا هەڵ نەوەشابۆوەو هەر جارەی بە ناوێكی دیكە خۆی دەر دەخستەوە.



كائیناتۆ بێ توانایی خۆی لە سیاسەتی دەرەوەش دا زۆر بە باشی سەلماند. پورتوگاڵ كۆنترین هێزی كۆلۆنیال بە داگیر كردنی ئانگۆلا, مۆزامبیكو گینەی بیسائۆ لە ئەفریقا, هێشتا ناوچەیەكی زۆری لەبەر دەست دابوو. ئەوانە هەموو لە كاتێكدا بوو كە ولاتانی داگیركراو لە لایەن بریتانیا و فەرانسەوە زۆر لە مێژ بوو سەربەخۆیی خۆیان وەدەست هێنابوو. لە نیوەی یەكەمی دەیەی شەست دا بەربەرەكانیی چەكدارانە لە ولاتانی داگیركراودا دەستی پێ‌كرد. لە ئاكامدا پورتوگاڵ تووشی شەڕێك بوو كە نیوەی بودجەی ولاتی قووت دەدا. ولاتێك كە ئەوكات واتە لە ١٩٧٤ دا ٩ میلیۆن كەسی حەشیمەت بوو, خاوەنی سوپایەك بوو دووسەد هەزار سەربازی هەبوو كە یەك لە چواری لە ئەفریقا جێگیر ببوو. تەواوی پیاوە لاوەكانی ولات ئەركی سەرشانیان بوو دەورەیەكی چوار ساڵەی سەربازی تێپەڕ بكەن كە نیوەی دەبووا لە ئەفریقا تێپەڕ ببا. ئەم شەڕە بە پێی بەراوردی ئەمرۆ رۆژانە یەك میلیۆن یۆرۆی خەرج بۆ دەولەت هەڵ دەگرت. پورتوگاڵ كە سەردەمێك تەنیا زلهێزی جیهان بوو, ببوو بە هەژارخانەیەك: لە هیچ جێگەیەكی ئورووپادا رادەی مردنی منداڵان و خەڵكی نەخوێندەوار ئەوەندە زۆر نەبوو, و هیچ كاتو لە هیچ ولاتێكی ئورووپادا خەڵكێكی ئاوا زۆر بە مەبەستی چوونەدەر ولاتی خۆیان بەجێ نەدەهێشت.

ئەو ئەفسەرانەی كە چەند ساڵ پێش دوور لە نیشتیمان خزمەتی خۆیان تێپەر دەكرد, یەكەم كەس بوون كە دەیان زانی شەڕەكەی دەدۆڕێنن. بەڵام دڵشكاویی ئەمانە ئەوكاتە زیاتر بوو كە بە فەرمانی حكوومەت ئەو هێزە شێوە نیزامیانەی تەنیا دەورەیەكی كورتیان لە راهاتنی شەڕ دیتبوو لەگەڵ ئەو ئەفسەرە پرۆفێشنالانەی خزمەتێكی زۆریان كردبوو لە هەموو بارێكەوە وەك یەكیان چاو لێ دەكرا. لە سێپتامبری ١٩٧٣ دا لە نزیك شاری ئێڤۆرا ١٥٠ ئەفسەر كۆبوونەوەیەكیان پێك هێنا. كۆبوونەوەی نهێنیی ئەمانە بزووتنەویەكی چەكدارانەی بە ناوی MFA ( ١ ) دامەزراند و بڕیارنامەیەكی دەر كرد كە كائیناتۆی ناچار كرد فەرمانە حكوومەتییەكەی وەربگرێتەوە.

بەڵام ئەوان بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر ویست و داوا شوغڵییەکانیان سوور نەبوون. هەر لە دیسامبری ئەو ساڵەدا ئەو گرووپە بەڵگەیەکیان بڵاو کردەوە کە لەودا ئەفسەران بە روونی دەیانگوت:" بە بێ دیموکراسی داهاتوویەکمان نابێ". لە مارسی ١٩٧٤ دا MFA بەم جۆرە باسی هەلومەرجی پورتوگالی کردبوو:" گێروگرفتی بنەڕەتیی خەڵك شەڕ لە سێ وڵاتی ئانگۆلا, موزامبیك و گینەیە.".

سێ حەوتوو بەر لەو رووداوە لە لیسبوون کتبێك لە ژێر ناوەی "پورتوگال و داهاتوو" دا بڵاو بۆوە کە وەك تەقینەوەی بۆمبێك لە هەموو جێگەیەك دەنگی دایەوە. نووسەرەکەی ئانتۆنیۆ سپینولا بوو, واتە جێگری سەرۆکی سوپا. ناوبراو بە چاویلکەیەکی بنە ئیستیکانییەوە, ژەنراڵێکی کۆنە پارێز بوو کە سەردەمێك لە سەر ویستی خۆی لە شەڕی نێو خۆی ئیسپانیادا شانبەشانی فرانکۆ شەڕی کردبوو. لە کتێبەدا گوتبووی پورتوگال لە رووی نیزامییەوە ناتوانێ لەو شەڕەدا سەر بکەوێ. بۆیە گەڵاڵەی جۆرێك فیدراسیۆنی وەك پێشنیار هێنایە گۆڕێ, هەرچەند دیارە سەربەخۆیی ناوچەداگیرکراوەکانیشی بە هیچ جۆر قبووڵ نەبوو. بەڵام مەسەلەی رەتکردنەوەی سەربەخۆیی لە کتێبەکەیدا گرنگییەکی پلە دووی هەبوو. گێچەڵەکە لێرەدا ئەوە بوو کە جێگری سەرۆکی سوپا بە رەسمی قبووڵی کردبوو کە ئیدی باوەڕی بە شەڕ لە ئەفریقادا نەماوەو ئەوەش جگە لە بێ هیوایی و ناهومێدیی تەواو شتێکی دیکە نەبوو. تەنیا پاش تێپەڕینی دوو حەوتوو لە بڵاو بوونەوەی ئەو کتێبە تەشقەڵەسازە پەنجا هەزار بەرگی لێ فرۆشا. بەڵام ئێستاش کەس نەیزانی بۆ کائیناتۆ ئیجازەی دا ئەو کتێبە چاپ بێ‌و هەر روون نەبۆوە کە داخوا ئەو کتێبەی خوێندبۆوە یان نا.

لە ژێر فشاری کۆڕوکۆمەڵە کۆنە پارێزە توندەکاندا کە ترسیان لێ نیشتبوو, کائیناتۆ لە ١٤ی مارسدا بەرپرسە پایەبەرزە نیزامییەکانی بانگ‌کرد تا پێکەوە بۆ جارێکی دیکە لە بارەی سیاسەتە کۆلۆنیالیستییەکانی کە پێشتر گرتبوویانە بەر یەکدەنگ بن‌و سوێندی وەفاداری بخۆن. سپینولاو بەرپرسەکەی واتە سەرۆکی سوپا فرانسیسکۆ داکوستا گومز تەنانەت زەحمەتی بەشدار بوون لەو کۆبوونەوەشیان بە خۆیان نەداو هەردووکیان رۆژی دواتر لە پۆستی خۆیان وەلا نران.



رۆژی ١٦ی مارس هێندێك لە یەکەی هێزەکان سەرپێچیان کردو دوو دەستەی پیادە نیزام بەرەو لیسبوون کەوتنە رێ. بەڵام شۆرشەکەیان سەرکوت کراو ٣٠٠ نیزامی گیران. ئێستا ئیدی کاتی ئەوە بوو کە MFA تا درەنگ نەبووە دەسبەکار بێ. لە ٢٣ی ئەپریل دا ئۆتلۆ ساراڤیا دیکارڤاڵهۆ فەرمانی تایبەتی شەوی ٢٤ی ئەپریلی دەر کرد. سەرگوردی قوتابخانەی شەڕ لە لیسبوون لە سەرەتای دەیەی ٦٠ دا وەك ئەفسەر لە ئانگۆلاو لە ١٩٧٠را تا ١٩٧٣ لە گینە خزمەتی کردبوو, ئەو شوێنەی کە ئەو لە بەرامبەر فەرمانی حکوومەتدا لە مەڕ بەرابەریی ئەفسەرە نیزامییەکان نارِزایەتیی لێ وەرێ خست.

هێشتا زایەڵەی دەنگی گۆرانیی "گراندۆلا شاری سووتاو" هەرمابوو کە لە ٢٥ی ئەپریلی ١٩٧٤ دا دووهەمین هەنگی زرێهی لە شاری سانتارم لە ٨٠ کیلۆمەتریی باکووری لیسبوونەوە بەرەو پێتەخت وەرێ کەوتن.کاتژمێر سێی سەر لە بەیانی گەیشتنە شوێنێك بە ناوی پراکا دۆ کۆمەرسیۆ لە نێوەڕاستی پێتەختدا. کاتژمێرێك دواتر فرۆکەخانەو تەلەفزیۆنی دەوڵەتییش کەوتنە بەر دەستی هێزە شۆرشگێرەکان. هەر لە یەکەم ساتەکانی بەربەیانی لە سەرانسەری وڵاتدا ئەفسەرانی MFA چ بە خۆشی بێ یان بە زۆری یەکە نیزامییەکانیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.

کاتژمێر دەی بەیانی لەشکرێکی نیزامی نێردرایە پراکا دۆ کۆمەرسیۆ. بەڵام سەروانێکی لاو بە ناوی ساڵکۆریۆ مایا کە فەرماندەیی یەکە شۆرشگێڕکانی لە شاری سانتارم لە ئەستۆ بوو, فەرماندەی سەر بە رێژیمی رازی کرد خۆی تەسلیم بکا. یەکەیەکی دیکە کە هەر بۆ ئەو شوێنە بەرێ کرابوو, بە زووترین کات رەگەڵ راپەڕینی ئەفسەرەکان کەوت. پاشان فەرماندە مایا لەگەڵ تاقمێك بەرەو سەربازخانەی کرمۆ رۆیشت, واتە شوێنی سەرەکیی نیشتەجێبوونی پاسەوانانی کۆماریخواز کە کائیناتۆو دەوڵەتە لە سەرەمەرگەکەیدا لەوێ دامەزرابوون. پاشماوەکانی یەکەکانی وەفادار بە رێژیم هەوڵیان دەدا بەر بە پێشڕەویی وان بگرن. بەڵام بێ سوود بوو: هەزاران کەس لە خەڵکی شاری لیسبوون کە بە هۆی بانگەوازی MFA رژابوونە شەقامەکان و شوێنە گرنگەکان, رێگەیان لێ گرتن.

له كاتژمێر ١ی نیوەڕۆ دا ئەفسەرانی راپەڕیو ئۆلتیماتۆمێکیان دا بە کائیناتۆ و سەرکۆمار ئامیریکۆ تۆماز کە ئەویش پەنای بردبۆ سەربازخانەی کامۆ کە ئەگەر تا کاتژمێر ٥ی ئێوارە خۆیان تەسلیم نەکەن, هێرشیان دەکەنە سەر. کائیناتۆ ئامادەیی خۆی بۆ وتووێژ لەگەڵ سپینولا کە ئەندامی MFA نەبوو و تەنیا شەوی بەر لە راپەڕینەکە ئاگاداری نەخشەکە بوو, راگەیاند. سپینولا لەلایەن ئەفسەرانی راپەڕیوەوە وەك نوێنەر قبووڵ کرا و لەگەڵ سەرۆك وەزیران کەوتە وتووێژ. کائیناتۆ رای گەیاند ئەگەر سپینولا بەرپرسایەتیی دەوڵەتی نوێ بگرێتە ئەستۆ, ئامادەیە دەست لە کار بکێشێتەوە. نزیك کاتژمێر ٦ی ئێوارە ئاڵای سپی لەسەر سەربازخانە هەڵ درا. ٤٠ دەقە دواتر وتەبێژی MFAلە رێگەی رادیۆوە رای گەیاند هێزەکانی سەر بە حکوومەت تەسلیم بوون. کاتژمێر٧/٣٠ی ئەو شەوە کائیناتۆ لەگەڵ وەزیرەکانی نێوخۆ و دەرەوە سەربازخانەیان بەجێ هێشت و بۆ ناوەندی فەرماندەیی ئەفسەرانی شۆرشگێر راگوێزران.

## خۆپێشاندانی چەپەکانی ئەڵمان لەگەڵ خەڵکی پورتوگال لە " دژی ناتۆ, فۆردو شمیس"

لەو نێوە دا لیسبوون ئاڵۆز بوو و هەموو لایەك پیرۆزباییان لە یەکتری دەکرد. لە راستیدا راپەڕین ببوو بە جێژنێکی نەتەوەیی. خزمەتکارێکی ژن کە لە شوێنی کارەکەی را دەگەڕایەوە ماڵە خۆی گوڵە مێخەکێکی خستە لوولەی چەکی سەربازێکەوە. وێنەگرێك ئەم دیمەنەی تۆمار کردو بۆ هەتا هەتایە کردی بە سەمبولێك بۆ شۆرشێکی بێ خوێنرێژی.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئاپۆرای خەڵك بەرەو رۆئا کاردۆسا, واتە ئەو شوێنەی ناوەندی پۆلیسی بێزراوی نهێنیی لێ بوو, وەڕێ کەوتن, بە گوللە پێشوازیان لێ کرا. چوار کەس کوژران. بە رواڵەت ئەمانە تەنیا قوربانیانی ئەو رۆژە لەبیرنەکراوە بوون: رۆژی دواتر دوایین بەرگریکارانی پاشماوەی رێژیمی نیزامی خۆیان بە دەستەوە دا.



پاش ئەمە لە زووترین کاتدا ژەنراڵ سپینولا خۆی وەکوو فەرماندەی وەفدێکی حەوت کەسی"حکوومەتی رزگاریدەری نەتەوەیی"ناساند. پۆلیسی نهێنیی پورتوگال ڤۆڵژیۆن هەڵوەشایەوە و سەدان زیندانیی سیاسی ئازاد بوون. کائیناتۆ و تۆماز بۆ دوورگەی مادریای پورتوگال لە زەریای ئەتڵەسی دوور خرانەوە و چوار حەوتوو دواتر وەك پەنابەر چوونە برێزیل وکائیناتۆ لە ساڵی ١٩٨٠ دا هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد. لە کۆتایییەکانی ئەپریل دابوو کە رێبەرانی حیزبی چەپ توانیان بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان: ماریۆ سۆڤارز رێبەری حیزبی سۆسیالیست کە لە ساڵی ١٩٧٣ دا لە بۆن دامەزرابوو و ئاڤارۆ چونال رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی پورتوگال کە ١١ ساڵی زیندانیی کێشابوو و توانیبووی را بکا. لە یەکەمی مارس دا ٥٠٠ هەزار کەس ئازادی و دەست پێکردنی قۆناخی نوێیان کردە جێژن.

داخوا بە راستی لە ٢٥ی ئەپریل دا شۆرشێك رووی دابوو؟ وا وێ دەچێ ئەوەی رووی دابوو زیاتر دەکرێ وەك کوودیتایەك سەیری بکەین, دیارە کوودیتایەك کە خەڵك بە تەواوی قبووڵی بوو, کوودیتایەك کە کۆتایی بە دیکتاتۆرێك هێناو, بوو بە هۆی دەرکەوتنی دوورە دیمەنێکی دێموکراتیك. دیارە ئەفسەرەشۆرشگێرەکان لانیکەمی لێکدانەوەیەکی روون و یەکدەستیان لە لایەنە سیاسی و ئابوورییەکانی پورتوگال نەبوو. ئەوەی ئەوانی لێك کۆ کردبۆوە و رێکی خستبوون, کۆتایی هێنان بە شەڕ لە وڵاتە داگیرکراوەکانی ئەفریقا دابوو. هەر راست لە بەر ئەمەش بوو کە بە دوای شۆرشی گوڵە مێخەکەکاندا بۆچوونی بە تەواوی لێك جیاوازی سپینولا و MFA بە روونی و بە ئاشکرایی دەرکەوت. لە حاڵێك دا ژەنراڵی کۆنەپارێز لە یەکەم وتەی رەسمیی خۆیدا وەك رێبەری حکوومەتی نیزامییەکان باسی لە "مانەوەی میللەت لە هەموو کیشوەرەکاندا" کرد. بەڵام ئەفسەرانی راپەڕیو لە بەرنامەی راگەیەندراوی خۆیان دا دەیانگوت:" دەبێ بناخەیەك بۆ سیاسەتی دەرەوەی خۆمان هەڵبژێرین کە ئێمە بەرەو ئاشتی بەرێ." سپینولا فیدراسیۆنێکی مەبەست بوو, بەڵام ئەفسەرانی شۆرشگێر لە سەر سەربەخۆیی وڵاتە داگیرکراوەکان سوور بوون.

سەرەنجام لەو کێشەیەدا MFA بە سەر لایەنەکەی دیکەدا سەرکەوت. بەڵام لەو نێوەدا سپینولا لە لایەن حکوومەتی نیزامییەکانەوە وەك سەرکۆمار هەڵبژێردرابوو و لە سەر باوەڕی خۆی هەروا سوور بوو: لە سێپتامبری ١٩٧٤ لە ڕۆژی بەخشینی بەڵگەی سەربەخۆیی بە گینەی بیسائۆدا نابراو رەگەڵ رەوتی کۆنەپارێز "زۆرایەتیی بێدەنگ" کەوت تا بە سەرنجدان بە "بێ سەرەوبەرەییەك کە لە حاڵی پەرەگرتندا بوو" پشتیوانیی لێ بکەن. نیشانەکە بە تەواوی روون بوو. رەوتێك لە ژێر ناوی "هێزی چەکدار بۆ ئازادیی پورتوگال" دا دیسان وەڕێ کەوتەوە. کاتێك دوو حەوتوو دواتر " زۆرایەتیی بێدەنگ" بەڕاستی بۆ پشتیوانی لە سپینولا بڕیاریان دا خۆپێشاندان وەڕێ بخەن, هەڵسووڕاوانی چەپ لە شەقامەکانی لیسبوون سەنگەریان لێ دا و لە لایەن MFAوە پشتیوانیان لێکرا. ژەنڕاڵی چاویلکە بنە ئیستیکانی بێ ئەوەی هیچ ئاکامێکی هەبێ, داوای راگەیاندنی هەلومەرجی نائاسایی لە شوورای حکوومەت کرد. دوو ڕۆژ دواتر دەستی لە کار کێشایەوە و ژەنراڵ کوستا گومز جێگەی ئەوی گرتەوە.

قەیرانی مانگی سێپتامبر کاری کردە سەر ئەفسەرانی MFA. کاتێك سپینولا لە مارسی ١٩٧٥ دا هەوڵێکی ناکامی بۆ کوودیتایەك ئەنجام دا,و هێزەکانیان هێرشێکی کردە سەر یەکە نیزامییەکانی چەپ, MFAش تووشی توندڕۆیی بوو. ڕۆژێك پاش کوودیتای بێ ئاکام و پاش ئەوەی سپینولا لە ئیسپانیای فرانکۆدا خۆی شاردەوە, شووڕایەکی بەهێزی شۆرش لە ئەندامانی MFA پێك هات. ئەم شوورایە ئەندامانی حکوومەتی نیزامییەکانو شوورای کاتیی حکوومەتی گۆڕیو لە دیاریکردنی کاربەدەستانی نوێ بۆ وەزارەتخانەکانی نێو خۆ و دەرەوەدا رۆڵێکی گرنگی گێڕا. هەروەها لە دانانی یاسادا توانی مافی ڤیتۆ لە بەرامبەر پارڵماندا بۆخۆی دابنێ. پاشان نۆبە گەیشتە بانکەکان و پیشەسازیی قورس کە هەموویان میللی کران وبەرنامەیەك بۆ چاکسازیی پێکهاتەی کشتوکاڵ راگەیەندرا. شوورای شۆرش لە هەنگاوێکی قورس و قاییمدا هێندێك فەرمانی دەرکردن لەسەر ئەو ئەساسە کە دەبێ لە دەستووری بنەڕەتیی نوێدا وەك بەرزترین سەرچاوە بە رەسمی بناسرێ. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا زۆربەی حیزبەکان بەڵگەیەکیان مۆر کرد ـــ یان بە ویستی خۆیان یان هەلومەرج بە سەریدا سەپاندن ـــ کە بە پێی ئەو بەڵگەیە دامەزراندنی سیستەمێکی



سۆسیالیستیو میللیکردنی پیشەسازی و ناوەندەگەورەکانیان بە ئەرکی خۆیان زانی. لە ٢٥ی ئەپریلی ١٩٧٥ دا واتە ساڵێك دوای شۆرشی گوڵە مێخەکەکان ئەندامانی مەجلیسی دامەزرێنەرانی یاسای بنەڕەتی, هەڵ بژێردران.

توندڕۆیی, خەڵك و کۆمەڵیشی بێبەش نەکرد. کرێکارانی بەشی کشتوکاڵ دەستیان بەسەر زەوی و زار دادەگرت. کرێکاران ئەو بەڕێوەبەرانەی لێیان ناڕازی بوون زیندانی دەکرد. زۆربەی کۆمپانیا و دامەزراوەکان لە ملکایەتی کەوتن. خوێندکاران رێگەی چوونە زانستگەیان لە مامۆستایانی دژی شۆرش دەگرت. دەرگای یانەکانی گۆڵف بەسەر هەموو کەسدا کرانەوە و تابلۆ تایبەتییەکان کۆکرانەوە. لە هەموو جێگەیەکی پورتوگال ئاڵای سوور شەکایەوە. لە کۆشکی کرێملینیش گوێیەکان لە سەر هەست بوون. کۆمپانیای فڕۆکەی ئیرۆپلۆتی رووسی بە هومێدێکی زۆرەوە هێڵێکی نوێی هەوایی مۆسکۆ ـــ لیسبوون ـــ هاوانای وەڕێ خستبوو. لەو خۆپێشاندانانەی لە پێتەخت وەڕێ دەخران هێندێك دروشم بە زمانی ئەڵمانییش دەدران," پورتوگال نابێ ببێتە شیلیی ئورووپا."یان" لە دژی ناتۆ, فۆرد و شمیس ـــ شەڕی شۆرشگێڕانە". ئێستا ئیدی لیسبوون ببووە رووگەی شۆرشگێڕانی سەرانسەری جیهان. لە ١٢ی نوڤەمبەری ١٩٧٥ دا کرێکارانی ساختومانی شوێنی پێکهاتنی مەجلیسی دامەزرێنەرانیان بۆ ماوەی ٣٧ کاتژمێر گرت. دەوڵەت بە نیشانەی نارەزایەتی مانی گرت و کارەئاساییەکانی حکوومەتیی راگرت. دووحەوتوو دواتر پەڕەشووتەوانەکانی سەر بە هێزە شۆرشگێڕەکان تەواوی فڕۆکەخانەکانی وڵاتیان داگیر کرد و ژەنراڵێکیان دەسبەسەر کردو خوازیاری لەسەر کار لاچوونی فەرماندە نیزامییەکانیان بوون.

## شۆرش باوکی خۆی وەلادەنێ

نەزمو دیسیپلین لە سوپادا بە خێرایی لە نێو دەچوو. پورتوگال لە دەروازەی ئاڵوگۆڕێکی قووڵی شۆرشگێڕانەدا بوو. یان باشتر بڵێین لە سەرەتای شەڕێکی نێوخۆییدا بوو. لەو کاتەدا سەرکۆمار فەرمانێکی بۆ حکوومەتی نیزامی دەرکرد. هێزەکانی سەر بە دەوڵەت سەرنجام

توانیان شۆرشەکە سەرکوت بکەن و سەربازە هەڵگەڕاوەکان دەسگیر بکەن. ئۆتیللۆساراڤیا دیکارڤالۆهۆ واتە گەڵاڵەدارێژی ئەسڵیی شۆڕشی گوڵەمێخەکەکان کە هەر لەو کاتەش دا ڕێبەری قۆڵی چەپی MFA و فەرماندەی هێزە نیزامییەکانی نیشتەجێ لە لیسبووندا بوو, لە لایەن شووڕای شۆڕشەوە تەواوی برپرسایەتییەکانی لێ ئەستێندرایەوە. بەم جۆرە کوودیتایەکی نوێ کە ئەم جارە لە لایەن قۆڵی چەپەوە بەڕێوە دەچوو, پووچەڵ کرایەوە. پاشان پرۆسەیەکی دژوار و لەسەرخۆی ئاسایی کردنەوەی هەلومەرج دەستی پێکرا. لە ئەپریلی ١٩٦٧دا قانوونێکی بنەڕتی پەسند کرا کە ئەرکێکی دەخستە سەرشانی دەوڵەت بەرەو سوسیالیزم و کۆمەڵایەتیکردنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بچێ. هەرچۆنێك بێ تێپەڕینی کات دەری خست ئەمانە لە قسە زیاتر شتێکی دیکە نەبوون. لە هەڵبژاردنەکانی دووەمین ساڵرۆژی شۆرشی گوڵە مێخەکەکاندا حیزبی سۆسیال دیمۆکرات بە ڕێبەرایەتیی ماریۆ سۆڤارز بە دەسەڵات گەیشت. دوو مانگ دواتر ژەنڕاڵ ڕامالهۆ ئینس کە کوودیتای قۆڵی چەپی تێك شکاندبوو, لە لایەن خەڵکەوە وەك سەرکۆمار دیاری کرا. بەم جۆرە پورتوگال ڕێگەی خۆی بەرەو دیموکراسییەکی پاڕلەمانیی ئاسایی گۆڕی.

زەکا ئالفۆنسۆ کە گۆرانیی "گراندۆلا شاری سووتاو"ی ئەو لە شەوەکەی مانگی ئەپریلی ١٩٧٤ دا ببوو بە دروشم و ڕەمزی ئازادی نەی دەتوانی ناخۆشحاڵیو ناهومێدیی خۆی وەك زۆر لە شۆڕشگێڕەکانی دیکە بە هۆی ئەو ڕێگەیەی کە پورتوگال گرتبوویە بەر, بشارێتەوە. ئەو لە یەکێك لە دواین شێعرەکانی خۆی دا کە بەر لە مەرگی خۆی گوتبووی دەڵێ:" ئیدی چۆن دەکرێ بژیم/ کاتێك ئازادی فرۆشاوە/ لە ئازادیی فرۆشراو دا/ تەنیا مەرگە دەمێنێتەوە .

(١)MFA کورت کراوەی Movimmento das Forcas Amadas ە واتە بزووتنەوەی سەر بە هێزە چەکدارەکان.

**وەرگێڕان بۆ فارسی:**

**علی محمد طباطبایی**